حکومەتا هەرێما کوردستانێ - عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام وچاپەمەنییا

# بابەتێن کۆمەلایەتی

## بۆ پۆلا شەشێ بنەڕەت

دانان و پێداچوون/ لژنەیەکا هەڤپشک
ژ ماموستاییێن زانکۆیی و وەزارەتا پەروەردێ

پێداچونەوەی زانستی / بەشی مێژوو
د. سەعدی عوسمان حسین

پێداچونەوەی زانستی/ بەشی جوگرافیا
هونەر جلال طاهر

کرما نجیبیا ژۆری

خلیل صالح احمد | حسن مصطفی حسن
دلخاز خاد محێ | طه یاسین طه

لێزڤرینا

فارس رشید جانگیر | رشید محمد طاهر حسن

چاپا پێنجێ ٢٧١٥ کوردی ٢٠١٥ زایینی ١٤٣٦ مشەختی

# وەلاتێ عێراقێ
# جهێ عێراقێ

ئەڤ وەلاتە هشتكاتییە دناڤبەرا كیشوەرێ ئاسیا و ئەورووپا دا ، هەر وەسا دەربەندەكێ ئاڤێ یە دناڤبەرا زەریا هیندی و دەریا ناڤەراست ، رووبەرێ عێراقێ (٤٣٨,٣١٧)كم٢ ، دكەڤیتە دناڤبەرا بازنێ پانێ (٢٩)-(٣٧) باكورێ هێلا یەكسان ، ودناڤبەرا هێلا درێژا (٣٨)-(٤٨) رۆژهەلاتێ هێلا گرینج.




بڤێ چەندێ درێژیا ئەردێ عیراقێ ٩٢٥كم وپانیا وێ ٩٥٠كم. وسنۆرێ هشكاتیێ ٣٥٠٠كم ، وسنورێ ئاڤێ كو دكەڤیتە سەر كەنداڤێ عەرەبی ٦٠ كم .

ل دەورو پشتێن عێراقێ کومەکا وەلاتانە کو ل رۆژهەلاتێ ئێرانە ب درێژترین سنور ، ول باکوری تورکیا یە ، ل رۆژئاڤا ( سوریا و ئوردن و سعودیە) نە ، ول باشوری ( کوێت و سعودیە و کەنارێن عیراقێ ل سەر کەنداڤێ عەرەب). جهێ جوگرافیێ عێراقێ یێ گرنگە بۆ هاتن و چونا ئەسمانی کو گرنگترین رێکا ئەسمانی یە دناڤبەرا ( ئاسیا و ئەوروبا و ئەفریقیا ) هەر وەسا عیراقێ گرنگیەکا ئایینی هەیە ب تایبەت بۆ (شیعا) کو ژ ئیران و لوبنان وسوریا و پاکستانێ و وەلاتێن دی هاتن وجونا دەڤەرێن بیرۆزێن (نەجەف و کەربەلا ) دکەن ل عیراقێ کو بویە ئەگەرێ داهاتەکێ نەتەوەیی بۆ ڤێ دەڤەرێ.

## پێکهاتنا روویێ ئەردێ عیراقێ:

پێکهاتنا ئەردێ عێراقێ ل دەڤەرەکێ بو دەڤەرەکا دی وەکی ئێك نینە ، نیشتەنیین روویێ ئەردێ عیراقێ ژ جورێ تیڤکلی یە ، کو ژ بەرێ ئاگری و گوهارتیی گەڤن نخافتیە کو هەتا قووناغا سیێ نخاڤتی بوو ب ئاڤا دەریا تیش، و ژ ئەنجامێن وان هۆکارێن نافخۆیی و دەرەکی کو دڤێ دەڤەرێدا رویدابن چیایێن بلند دروست بوون ژ ئەنجامێ وەرگێرانەکا مەزن کو دهێتە نیاسین ب ( لڤینا ئەلب ) کو بویە ئەگەرێ دروست بوونا زنجیرا چیایێن زاگرۆس وتوروس ، وچیایێن کوردستانێ بشکەکە ژ ڤێ زنجیرا چیا .

و دناڤبەرا چیادا دەڤەرێن نزم (کویر) دەردکەڤن کو ژ ئەنجامێ هەبوونا نیشتەنییا ( دردەم) رویبار نهال پردبنەڤە کو بشێوێ دەشتا دەردکەڤن.

و ژئەنجامێ جوداهیا هوکارێن پێکهاتێن ئەردێ عیراقێ روی ئەردی عیراقێ جوداهیا هەی ، ودئەنجامدا ئەم دشێین روویێ ئەردێ عیراقێ .

## ب سەر چوار دەڤەرێن سەرەکی پارڤەبکەین :

- ١- دەڤەرا چیای
- ٢- دەڤەرا زیرک

ئەڤ هەردو دەڤەرە دکەڤنە هەرێما کوردستانێ کو پاشی دێ ل بابەتێ هەرێما کوردستانێ خوینین .

- ٣- دەشتا نیشتەنی
- ٤- بانییا رۆژئاڤا

ئەڤ هەردو دەڤەرە ناڤەراست و ژێریا عێراقێ پێك دئینن.

## دەشتا نیشتەنی :-

سنورێ ڤێ دەڤەرێ ل باکوری هەتا باژێرێ سامەرا ل سەر ڕووبارێ دیجلە و باژێرێ رومادی ل سەر ڕووبارێ فورات دەسپێدکەت ، ول باشوری هەتا سەر کەنداڤێ عەرەبی درێژ دبیت ژ بەر هندێ بەشێن باشورێ ئەڤێ دەشتێ دنزمن ول بەسرا نزیکی (٥م) ژئاستێ رویێ دەریایێ بلندە ، لەورا بگرنگترین دەڤەرا چاندنا جورا و جورێ عێراقێ دهێتە دانان ، بتایبەتی برنج و جەهـ و گەنم وفێقی و زەرزەوات و دارا خورمێ ژی کو گرنگیەکا مەزن هەیە.

و ژبەر کو یێ پانە و راستە ئەڤچا خەلك ب ساناهی هاتن وچونێ دکەن و ب ساناهی رێکا دناڤبەرا جهێن ئاڤەدانکری دا دروست دکەن و ژ ئەگرێ گوم وچالکێن ئاڤێ ، هاتن وچون و ڤەگوهاستن دناڤ وان ئاڤاندا بسەناهی یە ، ژ گرنگترین وان گوم و چالکێن ئاڤێ گومکا ئاڤا حۆیزە یە لسەر ڕووبارێ دیجلە کو ب مەزنترین گومکێن ئاڤا عیراقێ دهێتە دانان ، هەر وەسا گومکا (زونگا) حەممار لسەر ڕووبارێ فورات کو ب دپلا دوێ دهێت ئەڤە و پتریا ئاکنجیێن عیراقێ دڤێ دەڤەرێدا دخۆجهن و مەزنترین باژێرێن عیراقێ هەر دکەڤنە ڤێ دەڤەرێ ، وەکی باژێرێن بەغدا ، بەسرە ، عەمارە ، دیوانیە ، ناصریە ، سەماوە، کوت ، ئەڤەژی ژ ئەگەرێ بسەناهیا هاتن و چونێ وپیتییا دەشتێ .

هەروەسا سامانەکێ زۆرێ نەفتێ تێدایە ب تایبەتی ل هەردو پارێزگەهێن بەسرە و میسان .

دەشتا لیتەیی (رەملی) کو روبەرێ ٢٤٪ ێ ژ رویی ئەردێ عیراقێ پێك دئینیت ، دابەش دبیت بۆ چەند بەشەکێن سەرەکی وەکی ( دەشتێن رویبارا ، دەشتا دلتا، دەشتێن کەنارا ، دەڤەرێن گومێن ئافا )زونگا) ، دەشتێن (شە تەس)، رەخێن رۆژهەلاتێ دەشتا نیشتەنی).

**بانیيا رۆژئاڤا :-**

دکەفیتە بەشێ رۆژئاڤا و باشورێ رۆژئاڤایێ عیراقێ ب درێژبوونا سرۆشتی یا بادیا شامێ و بانیا نیمچا گزیرتا عەرەبی دهێتە دانان .

ژ لایێ پێکهاتنێ ڤە بکەڤنترین بەشێن رویێ ئەردێ عێراقێ دهێتە هژمارتن کو ل چاخێن جیولوجیێن کەڤن پەیدا بویە ، رویێ ئەردێ وێ بگشتی مەیل و خارە و پانە و هندەك گرگێن نزم ل سەر هەنە .

بانیيا رۆژئاڤا کو روبەرێ ٥٥٪ ێ ژ رویێ ئەردێ عیراقێ پێك دئینیت ژبەر بەرفرەهیاوێ دەکەنە چەند بەشەك:-

١- **دەڤەرا نهالان :-** کومەکا نهالان بخۆڤە دگریت ژ رۆژئاڤا بەرەڤ رۆژهەلات دخوارن و ل رووبارێ فورات ب داوی دهێت وەکی نهالان حوران، وئەبیەز، ئەو رەخێن کو ژ رووبارێ فورات نزیکن هندەك چالێن مەزن تێدانە و بووینە دەریاچە وەکی حەبانیە و رەزاز . دڤێ دەڤەرێدا گەلەك کانزا هەنە ، وەك فوسفات و گوگرد ، خیزێ شیشەی .

٢- **دەڤەرا بەران:-** کو دکەڤیتە بەشێ باشورێ ڤێ بانیێ ، ل سەر رویێ بانیێ ژ چینەکا بەرێن رویت پێك هاتیە ژئەگەرێ رامالینا بای و، نەبوونا بەرگێ گیای،گرنگترین دیاردەیا ، ڤێ دەڤەرێ ژی نزمایێن ( سەلمان) ە.

**٣- بانیا جەزیرە :-** کو دکەڤیتە باکورێ رووبارێ فورات ، ب گشتی ل باکوری بەر ب باشووری خواردبیت ، نزماتیا (الثرثار) ب گرنگترین دیاردەیا سروشتی یا ڤێ دەڤەرێ دهێتە دانان

**٤- بانیێن رەخ برێ:-** کو چەندین مێرگ تێدانە وەکی مێرگێن کوبەیسە و رەحالیە و دڤان مێرگان دا دارێن خورمێ زور هەنە و خەلك لێ دئاکنجینە  و تەرش و تەوالی لێ خودواندکەن .

**٥- دەڤەرا دوبدوبە:-** دکەڤیتە داویا باشورێ رۆژهەلاتێ ڤێ بانیێ ، بشێوەکێ گشتێ رویی وێ یێ پانە ( راستە ) ، ژوێ رەمل و ئاخێ پێك دهێت  کو باو بابەلیسکان ژ دەڤەرێن دەوروبەرێن وێ ئینایە ، گرنگترین نهال کو د ڤێ دەڤەرێدا هەی نهالا ( باتن ) ە یا کویرو بەرفرەهـ .



## پرسیار

١- بۆجی دبێژنه عیراقێ پرا هشکاتی ؟

٢- جهێ عیراقێ لدویف بازنێن پان و وهێلێن درێژ دیار بکه ؟

٣- بەشێن رویێ ئەرێ عیراقێ چەندن ؟ بژمێره .

٤- بەشێن دەشتا نیشتەنی وبانییا رۆژئاڤا بژمێره ولسەر نەخشی دیار بکه .

٥- دەشتا نیشتەنی پتر بۆ ئاکنجیبوونێ یا باشه ، بۆ چی ؟

بەندێ دويێ

# ئاڤ و هەوايێ عيراقێ

ئاڤ و هەوايێ عيراقێ ب دەڤەرا هەوايێ نيمچەی خولگەيی هاتيە نياسين ، بەلێ باران بارينا وێ (نزمە زەپۆشەكان) دەريا ناڤەراست ، وسيفەتێ وێ يێ سەرەكی (جودايیا بلنديا پلێن گەرمێ يا رۆژانە وسالانە ) هەروەسا كێميا باران بارينێ و كێميا شەهێ وپترييا كەفتنا تيرۆژكا رۆژێ و كورتيا وەرزێ بهار و پاييزێ، د ئەنجامدا سيفەتێ ( ئاڤ و هەوايێ هشكی (قاری) وەردگرێت ) بەلێ پلا گەرمێ وباران و شەهێ دعيراقێدا ژ دەڤەرەكێ بۆ كو دەڤەرەكا دی ژێك جودايە ژ ئەنجامێ :-

١- بلندی و نزميا ئەردی : كۆ گرنگترين ئەگەرە بۆ نزمبوونا پلا گەرمێ ژ ئەەنجامێ رێژا بارينێ بلند دبيت و د گەهتە (٥٠٠ ملم و زێدەتر هەتا ١٠٠٠ ملم ) ل گوپيتكا چيايێ حەساروست ، هەر وەسا بلندی هوكارەكێ سەركی يە بۆ هەبوونا (بەفرێ ) بەلێ دەڤەرا نيمچە چيايی راددا بارانێ نزمترە دناڤبەرا (٥٠٠ملم - ٢٥٠ ملم) و چەند بەرەڤ باشورێ رۆژئاڤا بچين راددێ بارينێ كەمتر دبيت .

٢- جھ ل دويف بازنێين پانيێ : كۆ هۆكارەكێ سەرەكی يە بۆ بلند بوونا پلا گەرمێ و چەند بەرەڤ باشوورێ عيراقێ بچين ژبەر نيزيك بوونێ ژ خولگەو هێلا يەكسانيێ كۆكار دكەتە سەر درێژيا ماوێ رۆژێ وگوشا تيشكا رۆژێ.

٣- جھ ل دويف دەريا و زەريايان: بتنێ كەنداڤێ عەرەب و دەريايا ناڤەراست كاری تێدا دكەت . بەلێ ژبەر بچووكيا كەنداڤێ عەرەب كارتێكرنا وی كيمترە ژ نزمی و زەپوشەكانی دەريا ناڤەراست و ل سەر ئاڤ و هەوايێ عيراقێ ژ ئەنجامێ ڤان هۆكارا سێ دەڤەرێن ئاڤ و هەوای ل عيراقيێ هەنە :

أ- دەڤەرا ئاڤ و هەوايێ دەريا ناڤەراست : } كو دكەڤتە هەرێما كوردستانێ

**ب- دەڤەرا ئاڤ و هەوایێ نیمچە هشك ( گەرمەسێر ):**

**ج- ئاڤ و هەوایێ بیابانان:**

سیفەتێ وێ یێ گشتی پلا گەرمێ یا بلندە و کێم بارانە .وبارانا ڤێ دەڤەرێ ژ ٢٠٠ملم زیدەتر نابیت وساهیا عەسمانی هۆکارەکێ سەرەکی یە بۆ بلندیا پلا گەرمێ ، جوداهیا پلا گەرمێ دناڤبەرا شەڤ و رۆژاندا گەلەکە ب تایبەتی ل وەرزێ زفستانێ .




نەخشێ دەڤەرێن ئاڤ و هەوایێ عیراقێ

> **چالاکی:** گرۆپەك ژ قوتابیان نەخشەکێ دەست کرد ئامادە بکەن هەرێمێین ئاڤ و هەوای ل سەر دیار کەن :

## دەرامەتێ ئاڤێ ل عیراقێ

مەبەست ژ دەرامەتێ ئاڤێ ل عیراقێ هەمی جورێن ژێدەرێن ئاڤێنە ل ناڤ سنورێ عیراقێ کۆ ب سێ جورا دیار دبیت :

### ١-ئاڤا باران و بەفرێ:

ئەڤە یا هاتیە بەحس کرن د بەشێ ئاڤ و هەوای دا و ئەڤ دەرامەتە ئێکە ژ ژێدەرێن هەمە جۆرێن ئاڤێ ل عیراقێ ژبەر هەبوونا بەفرو بارانێ ل چیایێن کوردستانێ رووبارێ دیجلە و لقێن وی دروست بن ، ولهێن ڤی رویبارێ پشت بهوژینا بەفرێ لهەمی دەڤەرێن گرێددەت.

بەلێ ل دەڤەرێ دی یێن عیراقێ (دەڤەرا زیرگ و دەڤەرا بانیا رۆژئاڤا دەشتا نیشتەیی ) رادا بارانێ بتنێ (٢٠٠ملم–١٠٠ملم) ئەڤەژی بتنێ بۆ مفایێ پێك ئینانا جۆك وئاڤ دهێت ل دەمی نەهاتنا بارانێ.

### ٢- ئاڤا سەر روویێ ئەردی:

پێك دهێت ژ ئاڤا دیجلە و فراتی و لقێن وی و جوکێن وان و شەت ول عەرەب، هەمی دبەردەوامن ژبلی رووبارێ (عوزێم) نە بیت ژ لقێن دیجلە .

هەمی لقێن دیجلە ئەگەرەکێ گرنگە بۆ زێدە بوونا ئاڤێ لە زاتیا ڤی رویبارێ .

ژ ئەنجامێن بوونا ڤان رویبارن و لقێن وان کومەکا سکران( بەنداڤ پرۆژێن ئاڤدانێ وەکی سکرێ سەماوە وسکرێ کوت ) ل سەر دیجلە وسکرێ حدیثە و رەمادی و هیندیە ل سەر فوراتی و جوگێن

غەراف و دوجێلە ل سەر دیجلە و جۆكێن ( ئەسكندریە و لەتیفیە و موسەیب وییێن دی و تر ) ل سەر فوراتی كۆ بوویە ئەگەرێ زێدەبوونا رووبەرێ ئاڤێ سەر روویێ ئەردێ عیراقێ ژ بلی ڤانا هەبوونا دەریاچێن دروست كری د عیراقێدا و گۆم و زونگاوێن ئاڤێ وررووبەرێ ئاڤا سەر روویێ ئەردی یا زێدەبووی ب چی شێوە بیت ئەڤە گرنگترین ژێدەرێن ئاڤێ نە بۆ چاندنێ ل عیراقێ.

### ٣- ئاڤا بن ئەرد :

ژلایێ گرنگی ورێژا بكارهینانێ یا دووی یە پشتی ئاڤا سەر روویێ ئەردی هۆیێن كار دكەنە سەر ئاڤا بن ئەرد

١- ئاڤ و هەوایێ دەڤەرێ.

٢- شێوێ بلندی و نزمی .

٣- جۆرێ بەران .

ل دەڤەرێن ( هەرێما كوردستانێ) ئەڤ ئاڤە یا زۆرە ژ ئەنجامێن باران و بەفر بارینێ ل ڤێ دەڤەرێ ، هەروەسا جۆرێ بەرا و خاراتیا دەڤەرێ هاریكارە بۆ كۆمبوونا ئاڤا بن ئەرد ل دەڤەرێن دەشتا و دولا ل ڤێ دەڤەرێ .

ئاڤا بن ئەرد ل عیراقێ ل چار دەڤەرا هەیە :

أ- دەڤەرا چیایی ( ئاڤا زۆرە ).

ب- دەڤەرا زویرك ( ئاڤ كێمترە ژ یا ئێكێ) : ب ئاشكرا دكەڤنە چیایێن شنگال ل بانیا مووسل و دەشتا هەولیر و بانیا كەركوك و دەڤەرا خانقین .

جـ- دەڤەرا دەشتا نیشتەنی : ئاڤا وێ كێمترە ژ هەردوو دەڤەرن دی رێژا خوێ یا زۆرە.

**د- بانیا جەزیرە ئاڤا زۆرە:** بەڵێ تاما وێ یا خۆش نینە ژبەر هەبوونا گوگرد و کلۆر و کالسیۆم بو هوژی د ناڤ ئاڤا ڤێ دەڤەرێ.




نەخشێ رووبارو دەرامەتێن ئاڤێ ل عیراقێ

**چالاكی:** گرۆپەك ژ قوتابیان  راپۆرتەكێ ل سەر گرنگیا ئاڤێ ئامادە بكەن و دانوستاندنان ل سەر بكەن .

## پرسیار

١- مەبەست ب دەرامەتێن ئاڤێ چییە؟

٢- ئاڤا سەر ئەرد ل عیراقێ ژ چ پێك هاتیە ؟

٣- ئاڤا بن ئەرد ب پلا چەندێ دهێت ؟

٤- ئەو هوكار چنە كۆ كار دكەنە سەر رێژا ئاڤا بن ئەردی ؟

٥- ئاڤا  بن ئەردی یا ( دەڤەرا جەزیرە ) تاماوی یا خۆش نینە بۆچی ؟

بەندێ چارێ

## ئاخا عیراقێ

ئەگەرێ ئاڤ و هەوای و جورێ بەرا و بلندی و نزمی و رووەکی خورست ئەنجامێ سەرەکی یە بۆ هەبوونا هەمی جۆرێن ئاخێ د عیراقیدا .
کێم باران و بلندبونا پلا گەرمێ دبیتە ئەگەرێ هەبونا سویراتیا ئاخێ د دەمێ ئافدانێدا ، کێمبوونا رووەکێ خورستی ئەگەرەکە بۆ کێم بونا مادەێ ئەندامی د ناڤ ئاخێ دا ، هەبونا هەمی جورێن کانزا د ناڤ بەرێن دایکدا هوکارەکە بو قەلەویا ئاخێ ژ مادەیێن کانزایی وەکی (کالسیوم و گۆگرد و فوسفات و بوتاسیۆم و نایترۆجین و مەگنیسیۆم و مەنگەنیز و ئاسن و کلور ) .

### راهێنان

گەلەك رەنگیا ئاخێ دبیتە ئەگەرێ
هەمی رەنگیا وێ



**قوتابیێ خۆشتقی :** ڤان ڤالایا ب پەیڤەکا کۆنجای ژ ڤان پەیڤین خوارێ پربکە
رووەکی خورست ، ئاڤ و هەوا ، بەروبومێ چاندنێ

# رووەکی خورست

رووەکێ خورستی کۆمەکا هۆکارێن سرۆشتی کارتێکرنێ ل سەر دکەن وەکی باران بارین و پلا گەرمێ وجورێ ئاخێ و بلندی ونزمی کو ژ ئەنجامێ ڤان هۆکارا چار هەرێمێن رووەکێ نەوەك هەف ب ئاشکرا ل عیراقی دیار دبن :-

١- دەڤەرا دارستان و گژوگیایێ چیایی. } دکەڤنە هەرێما کوردستانێ
٢- دەڤەرا گیایێ کورت و گەرمەسیر (ئیستێپس)

٣- دەڤەرارووەکێ روبەرێن ئاڤێ .

٤- دەڤەرارووەکێ بیابانان .

**راهێنان**

دەربارەی گرنگیا دارستانێ دوو گرۆپێن قوتابیان راپورتەکێ بەرهەڤ دکەن و دێ دان و ستاندنێ لسەر کەن .

### ٣-دەڤەرا رووەکێ رووبەرێن ئاڤێ :

ل دەڤەرا دەشتا نیشتەیی ل باشورێ عیراقێ ب ئاشکرای دەردکەڤیت ، گرنگترین رووەکێن سرۆشتیێن ڤێ دەڤەرێ پێکهاتینە ژ لەڤەن و قەرەمێ بەلەك ، کو مفایێ ئابووری ژی یێ هەی.

### ٤-رووەکێ بیابانێ :

ئەف رووەکە بەرگریا گەرمێ و هشتکاتیێ دکەت ، کو ٧٠٪ ژ روبەرێ عیراقێ ڤەد گریت ، ئەف رووەکە ماوێ (٨) هەیڤا بەرگریایێ ئاڤی و پلەیا گەرمێ یا بلند دەکت . گرنگترین رووەکێ ئەڤێ دەڤەرێ پێکهاتینە ژ سندیان و خوارنا حێشترێ.

## چالاکیێن ئابووری

### کومەك ژ چالاکیێن ئاکنجیان ڤەدگریتن وەکی :-

### ئێك - چاندن :

ژ ئەنجامێ هەبونا روبەرەکێ ئەردێ راست و بەرفرەهـ د عیراقێدا و ژبەر هەبونا ئاڤ و هەواو دەرامەتێ ئاڤیی وئاخەکا ب خێر و بێر بزاڤێن چاندنێ رون وئاشکرا د عیراقێدا د دیارن هەر ژ کەڤندا حەتا نوکە بتر ژ ٥٠٪ ژ ئاکنجیان مژویلی چاندنێنە .

### بەرهەمێن چاندنێ عیراقێ دوو جورن:

١- دەخل ودان (گەنم و جەهـ).

٢- پەمبی و برنج .

گەنم بەرهەمەکێ چاندنێ یێ زستانییە و خوارنەکا سەرەکیا ئاکنجیانە ژی ل هەرێما کوردستانێ باش دیار دبیت . ژبەر هەبونا بارانێن تمام و ئاخەکا قەلەوو پلەیا گەرمێ یا گونجای. بەرهەمێ دەخل و دانی ژسالەکێ بۆ سالەکێ نەوەك هەڤە. ژ ئەنجامێ گورینا رادا بارانێ ژ سالەکێ بو سالەکادی . ٥٠٪ روبەرێ ئەردێ چاندنێ ب دەخل و دانی دهێتە چاندن.

جەهـ – ل پتریا باژێرێن عیراقێ ب ئاڤدانێ ل وەرزێ زفستانێ دهێتە چاندن ، پێدڤی ب ئاخا قەلەو نینە . پەمبی بەرهەمەکێ هاڤینیە ل پتریا باژێرێن عیراقێ ، ب ئاشکرا بەرچاڤ دگەڤیت ، بەلێ روبەرێ وێ دهێتە گوهۆرین و مەزنترین روبەر ل باژێرێن هەرێما کوردستانێە . وب تایبەتی پارێزگەها کەرکوکێ و ل رێزا دووێ دیالا و ل رێزا سیێ پارێزگەها بابل دهێت . بۆ پیشەسازیێ تەڤن رستنێ مفای ژێ دبینن

بەركێن وی (دندك) یا ب مفایە بۆ بیشەسازیێ روونی و سابینێ ، پاشماوێن دی ژی پشتی هێرانێ بو ئالفێ ئاژەلان بەرچاڤ دبیت ب كاردهێت .

هەر وەسا بەرهەمێ برنجی كو بەرهەمەكێ هاڤینیە ، ئێك ژ گرنگترین خوارنێت مرۆڤێن عیراقینە . ل پتریا باژێرێن عیراقێ ب ئاشكرای بەرچاڤ دبیت ل دەورو بەرێن رویباران ولێڤێن وان ژبەر پشت گرێدانا وی ب ئاڤدانێ یە.

پارێزگەها نەجەف ل رێزا ئێكێ دهێت ژ روبەرو بەرهەمێ برنجی كو ٤٤٪ روبەرێ بارێزگەها نەجەف برنج دهێتە چاندن . ژ ئەنجامێ هەبونا هۆكارێن هەبونا برنجی كو پێك دهێت ژ هەبونا ئاڤێ و ئاڤا پیسی و كلس و جۆتیاران . پارێزگەها موسەنە و پارێزگەها قادسیە ل رێزا دووێ وسیێ دهێن ژ چاندن و بەرهەم ئینانا برنجی .

هەروەسا برنج ل باژێرێن هەرێما كوردستانێ ژی دهێتە چاندن و باژێرێ سلێمانییێ ل رێزا ئێكێ یە و هەڤلێر و دهۆكێ ل رێزا دووێ وسیێ دهێن . هەر وەسا بێدڤیە بزانین كو ل پێنج پارێزگەهێن عیراقێ برنج ناهێتە چاندن وەكی ( بەغدا و ئەنبار و بابل و كەربەلا و سەلاحەدین )

### ٣- دار خورمە

ل دەشتا نیشتەنی ل عیراقێ ل رەخوروویێن رویباران ب ئاشكرا بەرچاڤ دبیت ب تایبەتی ل رەخورویێن شەت و ئەلعەرەب ، ئەگەرێ هەبونا وێ دزڤرتە ڤە بۆ هەبونا ئاڤێ وئاخا قەلەو یا نیشتەنی . و هەبونا پلا گەرما بلند و تیرۆشكا رۆژا هشك و (كێم شهـ) ٤٠٪ ژ ژمارێن دار خورمێن عیراقێ ل دەڤەرا شەت وئەلعەرەبن .

پارێزگەها بەسرە ل رێزا ئێكێ دهێت ژڤی بەرهەمی ب رێژا ٤٥٪ ژ سەرجەمێ بەرهەمێ خورمێ . پارێزگەها دیالا و ناسریە ل رێزا دووێ وسیێ دهێن .



وێنەیێ دارخورمان

ب کێر خوارنا مرۆڤان دهێت ل ناڤ وەلاتیا و داهاتییێ نەتەوەییە بۆ عیراقێ د دەمێ فرۆتنێدا ، و مفای ژێدکەن بۆ پیشەساز خوارنێ و پسکت و سیهێکێ ژبلی پیشەسازێ دۆشاڤا خورمێ . هەر وەسا ئەردێ عیراقێ کونجی ژی لێ دهێتە چاندن کو بەرهەمەکێ هاڤینیە مفای ژێ وەردکرن بۆ روینی و سابینێ. کەسکاتی ئێك ژوان خوارنێن سەرکیێن عیراقێنە بەلێ بێدڤێن ناڤ خوٚ پترە ژ وی بەرهەمێ دهێتە چاندن ل ناڤ ـ عیراقێ

هەر وەسا دارێ بەری (باخچێن فێقی) ژبلی خورمێ وەکی ( هنار ، سێڤ ، پرتەقال، خوخ ، گیز ، فستەق ، زەیتونان)، کو پرتەقال و لەیمون ل پارێزگەها بەغدا و دیالا ب باش بەرچاڤ دبن ب رێزا ئێکی و دووێ دهێن ل ناڤبەرا دارخورمان دهێنە چاندن بۆ وەرگرتنا مفای ژ سیبەرا وان . بەلێ دارا تری ل باژێرێ سلێمانییێ ب بەرچاڤ دبیت ، و باژێرێن هەڤلێر و دهۆکێ رێژە کێمترە . هەر وەسا هنار ل پارێزگەها بەغدا و دیالا و کەربەلا و ب ئاشکرای پێش چاڤ دبن ب رێژا ٧٠٪ بەرهەمێ عیراقێ ژڤی دارێن بەریە . زەیتون ل باژێرێن میسل ب

ریزا ئێکێ دهێت کو ٧٢ ٪ سەرجەم دارێن زەیتونێن عیراقێ ل ڤێ پارێزگەهێنە.
بەلێ گیز و فستەق ل بازێرێن کوردستانێ ب ئاشکرا پێش چاڤ دبن ب تایبەتی ل سلێمانیێ .



وێنێ کەسکاتی وفێقی

**ئاریشەیێن چاندنێ:**

١- کێم ب کار ئینانا پەینی (زبلی) .

٢- زوربونا ریژا خوێ ل ناڤ ئاڤا عیراقێ ل دەڤەرا ناڤەراست و باشورێ عیراقێ.

٣- نەزانینا جۆتیاران ب رێکێن نوی بۆ چاندنێ.

٤- نەبونا نەخشێ چاندنێ بوبەرهەمئینانا چاندنێ ب باشترین توڤ.

٥- نەبونا هاریکاریێ بۆ جۆتیاران بۆ دانا (سلفەی ) ل دەمێ کرینا توڤی و پەینی( زبلی) ، ئو زڤراندنا (سلفەی) ل دەمێ فرۆتنا بەرهەمی .

٦- ب کارئینانا سیستەمێ بەنورە (کێلان بێ چاندن) ل ئەردێ چاندنێ ئەگەرەکە بۆ کێم بونا بەرهەمێ جۆتیاران ب تایبەتی ل ئەردێن بچویك.

## دووێ ب خودانکرنا ئاژەلان:

ژ ئەنجامێ هەبونا هۆکارێن ب خودانکرنا ئاژەلان وەکی ( روبەرەکی ئەردێ بەرفرەه و هەبونا ئاڤێ و هەر وەسا هەبونا بازاری بۆ کرینا بەرهەمێن ئاژالی) ریژا وێ ژی بەردەوام دوەاریێدایە . و بەردەوام داخازی یا ل سەر زۆرە و ژ ئەنجامێ پێشکەفتنا ژیارا خێزانێن عیراقێ و زۆربونا هژمارا وان نوکە ژمارا ئاژەلان بێدڤێن ناڤ خۆییێ پر ناکەن ئو ب تایبەتی ژ گۆشتی . خودانکرنا ئاژەلان یا گرنگە چونکی خوارنا مرۆڤان و کەرستێن خاڤ یێن بیشەسازییێ خوارنێ دابین دکەت ، هەر وەسا پیساتییێ وی ژی پەینی ئەندامیە بۆ چاندنێ ب کاردهێت ، ژبلی ڤێ ژی ئێك ژچالاکیێن مرۆڤێن عیراقێنە . ئەم دشێین خودانکرنا ئاژەلان بکەینە چەند بەشەك:

## ١- ئاژەلێ گۆشت سور :

ژ بزن و میهـ مانگا وچێل و گامێش و حێشترا پێك دهێت ژبلی بەرهەمێ وان یێ گۆشتی بەرهەمێ شیرو هری و پیستی ژی یێ هەی، ل هەمی بارێزگەهێن عیراقێ یێن هەین .

گامێش ژبلی بەرهەمێ وی ئەم مفای ژی دکەین بۆ کارێ ل ناف زەڤێ ل دەمێ بەرێ بتنێ ل دەڤەرێن گۆم و پەنداڤا هەبوون لێ نوکە ل پتریا باژێرێن کو روبەرێ ئاڤێ هەی یێن لی پەیدابوین .

مەزنترین هژمارا میهان ل پارێزگەها مووسل پێش چاڤ دبیت و پارێزگەهێن دیالا و سەلاحەدین ل رێزا دووێ وسییێ دهێن . و مەزنترین هژمارا بزنان ل پارێزگەها سلێمانیێ یە وب رێزا دووێ وسییێ پارێزگەهێن دهۆك و هەڤلێرێ دهێن .

هژمارا چێلان ل پارێزگەهێن موویسان وزیقار نێزیکی ئێکن کو بترە ژ ( ٢٠٠٠٠٠ ) سەران . مەزنترین هژمارا گامێشا ل پارێزگەها بەغدا یە ئو پاشی ل میسان و بەسرا یە .

## ٢- پەلەوەر ( تەیروتەوال ) :

هەمی جورێن پەلەوەران ڤەد گریت کو بتنێ بۆ مەرەما گۆشتی نینە ، بەلێ گەلەك مفایێن دی یێن هەین . ب دوو رێکا دهێنە خودانکرن . ل زەڤیێن چوتیاران کو رێژەیا کێمە ئان ل زەڤیێن تایبەت بۆ خودانکرنا پەلەوەران ئەڤەژی دوو جۆرن:

١- پرۆژێن خودانکرنا پەلەوەران بۆ گۆشتی

٢- پرۆژێن خودانکرنا پەلەوەران بۆ هێکان . جهێ ئەڤان پرۆژان نێزیکی باژێران ( ب مەرەما نێزیکبوونێ ژ بازاری ) .



ب خودانكرنا مريشكان

ب مەرەما پێشئێخستنا ب خودانكرنا پەلەوەران چەندین جۆرێن بیانی ئینانە ناڤ بازارێ عیراقێ بۆ مەرەما زێدەكرنا هژمارا وان د ئەنجامدا باشترین جۆرێ پەلەوەرا ل پرۆژێن خودانكرنا پەلەوەرا دەركەفتن.

بەلێ هەتا نوكە بێدڤیێن ناڤخۆیی پرناكەن د ئەنجامدا ، پشكەك ژ پێدڤیا وان ژ دەرڤەری وەلاتی دئینن ب شێوێ ( مریشكێن سەر ژێكری) ژبلی زیدەباری ئینانا هێكان .

### ٣- ماسی :-

ژبەر هەبوونا هەردوو رویبارێن عیراقێ و لقێن وان ، هەر وەسا هەبوونا شەت ولعەرەب و کەنداڤێ عەرەبی رووبەرەکێ بەرفرەهـ پەیدابوو بۆ خودانکرنا ماسیان، ژبلی گرتنا ماسیان یا سرۆشتی چەندین برکێن ب خودانکرنا ماسیان یێن دەستکرد ل عیراقێ دپێش دبن .

### ئاریشێن بەرهەمێ ئاژەلی : -

**أ- ئاریشا سرۆشتی :** ژ ئەنجامێ جوداهیا ئاڤ و هەوایێ عیراقێ کو دهێتە نیاسین ب جۆرا و جۆریا پلێن گەرمێ و گهۆرینا بەردەواما رێژا باران بارینێ وئەڤە دبنە هۆکارێ دروستکرنا جهێن تایبەت بۆ ئاژەلان ژبۆ دویرکەفتنا وان ژ مەترسیا ئاڤ و هەوایێ نە گونجای .

کێمیا ئاڤێ ب تایبەتی ل ناڤەراست و رۆژئاڤایێ عیراقێ کو ئێکە ژ مەترسیێن تۆشی ئاژەلێن عیراقێ دبن ول ( کوردستانا عیراقێ ) توشی ئاریشا کێم باران و بەفرێ دبن ل هندەك سالا ود ئەنجامدا مەترسسیەکا زۆر لسەر ئاژەلێن عیراقێ پەیدا دکەن . ژ ئەنجامێ کێمیا کوزێن (لەوەرگا) ئاژەلان رووبەرێ لەوەرگ د بچووکن ئەڤجا گژوگیا تێرا ناکەت وئەڤەژی دبیتە ئەگەرێ بلندبونا رێژا ژ ناڤچونا ئاژەلان .

**ب- هۆکارێ مرۆڤی :** ژبەر گهۆرینا داخوازیا ئاکنجیان یا بەردەوام ژ گۆشتێ سۆر بۆ بالندان یان ماسیا و بەرۆڤاژی ژی دەرکەڤت ، هەر وەسا نەبوونا خزمەتێن ساخلەمیێ یێن فیترنەری (بەیتەری) ب شێوەکێ رێك وپێك ل هەموو دەڤەرێن عیراقێ . ب تایبەتی ل جهێن خودانکرنا بالندان .

## سێ - پیشەسازی :

پیشەسازی ل عیراقێ بەرەڤ پێشکەفتنێ بوو هەتا سالێن بەری ١٩٨٥ ز وە د دناڤبەرا ١٩٥٤ز –١٩٨٥ز مەزنترین پلێن پێشکەفتنێ بخۆڤە دیتیە .....

سالێن بەری ١٩٥٤ز بتنێ ٥٪ ێ ژ دەستێ کارکەران د پیشەزایدا هەبوو، ٩٩٪ێ ژڤان پیشەسازیان ژ جۆرێ بچووکە ول مال دا بوون کو دناڤبەرا (١ کرێکار – ٢٥ کرێکاران) کار تێدا دکر .

و ژئەنجامێ بچووکیێ ، پێدڤیێن نافخۆیی پڕ نەدکرن ، وپرانیا وان ژ جورێ رستنێ و دورینا جل و بەرگان و خوارنێ بوون .

چەند یاسایێن میری دەرکەفتن بۆ وەرارکرنا پیشەسازیێ ، و ژوان :–

١– دانانا بانقەکێ بۆ قەرزدانا پارەی .

٢– لێبورینا وان ژ باجێ یان کێمکرنا رێژا وێ .



وێنێ کارگەهەکێ

## پیشەسازیێ ناڤخۆیی دبیتە چار جۆر :-

١- پیشەسازیێ پشت ب بەرهەمێ چاندنێ وئاژەلی گرێدەت وەکی خورما دناڤ قودیکادا و هێرانا گەنم و جەهی وپیشەسازیێ هەڤیر و نانی و روینێ کونجیا و بیرێ ... هتد .

وپشەسازیێ پشت ب پەمبی گرێدەت وەکی بەتانیا ... هەر وەسا پیشەسازیێن شەربەتێ وجگارا و ماست وپەنیری هەر وەسا پیشەسازیێ رستن و چنینێ ( هریێ و حەریری).

٢- پیشەسازیێ پشت ب بەرهەمێ کشتوکالی نافخۆیی گرێدەت وەکی پیشەسازیێ روینێ رووەکی ژ پەمبی و کونجیا و جۆرێن گول بەرۆژا پیشەسازیێ سابینێ ژ روینێ زەیتونان ، پیشەسازیێ شرینیا ژ گەنم وبرنج و کونجیا و فیقێ و گویزا و فستەقان .

هەر وەسا پیشەسازیێ شەکرێ ژ چەوەندری و قامیشێ شەکرێ.

هەر وەسا پیشەسازیێن داری وەکی دروستکرنا تشتێن ناڤ مالێ.

> **چالاکی:** گرۆپەك ژ قوتابیان راپۆرتەکێ ل سەر گرنگیا ئاڤێ ئامادە بکەن و دانوستاندنان ل سەر بکەن .

٣- پیشەسازیێن پشت ب کەرەستێن خاڤ یێن نە گشتوکالی ڤە گرێدای ، وەکی چیمەنتویی و گێچێ و تابوقکا و کونکریتی و کاشی ویێن دی کو بۆ دروستکرنا خانیا دهێنە بکار ئینان.

٤- پیشەسازیێن کو پشت ب کەرەستێن خاڤ یێن ژ دەرڤە گرێد دەن .

هەموو تشتێن دروستكری یێن مەتبەخێ كو پێویستی ب ئاسن و سفر و ئەلەمنیومی هەیە ، هەر وەسا پیشەسازیێن زیڤ و زێری بكاردینن و هەر وەسا دروستكرنا مەكینە و ئامیریێن چاندنێ وپیشەسازیا ترومبێلا ، هەر وەسا پیشەسازیا چێكرنا پەنجەر و دەرگەهان .

**پرسیار :**

پیشە د عیراقێدا دبنە چەند بەش ؟ بژمێرە

ئێك ژ گرنگترین پیشەسازیێن عیراقێ ( نەفتە) كو پشتی دەریخستنێ دچیتە پارزیینێ ل چەندین پارزینگەهێن عیراقێ ل كەركوكێ و بەغدا و بەسرە كو ب پیشەسازیێن پترۆكیمیاوی دهێنە نیاسین ، هەر وەسا پیشەسازیا ڤیری بۆ دروست كرنا رێكێن ترومبێلا ل عیراقێ و پیویستی پێ زێدەدبن لگەل پتر بوونا دەڤەرێن شارستانی.

هەر وەسا پیشەسازیا چیمەنتویێ كو ل دەڤەرێن سلیمانیێ و میسلێ و سەماوە وهندیە وبەغدا بەرچاڤ دكەڤیت.

**دەركەفتنا پیشەسازیێ ل هەر دەڤەرەكێ گریدایە ب :-**

١- كەرەستێن خاڤ .
٢- هەبوونا رێكێن هاتنووچونێ.
٣- مەسرەف وپارێ مەزاختی .
٤- سیاسەتا حكومەتێ .
٥- پیویستیا ئاڤێ .
٦- هێزا كاری .
٧- بازار .



دیمەنێ بازاری

وپتریا وان ل عیراقێ هەنە بتنێ سیاسەتا حکومەتێ نەبیت ژ بەر هەبوونا شەرێ عیراقێ و ئیرانێ ول پشتی وی شەرێ کویتێ و دۆرپێچا ئابووری بۆ ئەگەرێ پاشئیخستنا دامەزراندنا پرانیا پیشەسازیان ل عیراقێ .

## چارێ - دەرێخستنا کانزایان :-

جۆرێ بەری وپێکهاتنا جیولوجی هوکارەکێ سەرەکیە بۆ هەبوونا کانزایان ، دشێن بێژین پتریا کانزا ل عیراقێ ژ جۆرێ کانزایێن نە فلزی نە وەکی (نەفت و رەژیا بەری ، خوێ و گازا سرۆشتی ) ژبەر هەبوونا بەرێ نیشتوو ل پرانیا رووبەرێ عیراقێ پەیدا دبن .

هەروەسا جۆرێ کانزایا فلزی بەلی ل دەڤەرێن بچووك هەنە ل زنجیرێن چیایێن بلندێن هەرێما کوردستانێ ژبەر هەبوونا بەرێ ( ئاگرین و گورین) وەکی کانزایێ زێر و رساس وئاسن ... هتد .

بەلێ لێگەریان لدویڤ کانزا ل عیراقێ ژلایێ کومەکا کومپانییێن بیانی ڤەیە ، مەزنترین رێژە ژ کانزایێن عیراقێ کانزایێ نەفتێ یە کو ل پرانیا دەڤەرێن عیراقێ ب تایبەتی ل دەڤەرێن نیمچە چیایی ، ل راپۆرتا لیژنا بەریتانی پتر ژ (٢٠ جۆر کانزا). وشێوێ دابەشبوونا کانزا ل عیراقێ بڤێ شێوی ل خارێ یە :

| جۆرێ کانزایی | دابەشبوونا جوگرافی |
| --- | --- |
| نەفت | کەرکوك ، خانەقین ، عین زاله ، قیاره ، زوبیر ، میسان ، کویە ، مەخمور ، کەکەك . |
| قیر | گەیارە ل مووسلێ ، حمام علیل ل مووسلێ |
| ئاسن | ئامێدیێ ، رەواندز ، قەلادزێ ، چوارتە و سلیمانییێ ، پێنجوین . |
| سفر | رەواندز ، قەلادزێ ، چوارتە و سلیمانییێ ،هەڵەبجە . |
| فوسفات | ل دەڤەرا (H۲ ۲۰) ل روتبە ل پارێزگەها ئەنبار . |
| زێروزیڤ | ئامێدیێ و قەلادزێ وروتبە. |
| رساس | ل زاخۆ و ئامێدیێ |
| کروم | رەواندوز. |
| باریت | زاخو و ئامێدیێ. |
| مەگنسیۆم | رەواندوز. |
| رەژیا بەری | ل کفری و ئەنجانە . |
| یورانیوم | (H۲ ۲۰) ل ئەنبار و دهۆکێ . |
| گوگرد | دهۆك ، میسل و کەرکوك وفەتحە . |
| خوێ | چوارتە و رەواندوز وئامێدییێ و کەربەلا و سەماوە و |
| مەرمەر و هەلان | شەنگالێ . |
| خیزێ شیشەی | هەلەبجە ، وچوارتە ، قەلادزە و رەواندوز و پیرمام |
| گرانیت | کەربەلا و کوفە وروتبە و نەجەف . |
| وکوارتز | چوارتە |

**پرسیار :** بۆچی کانزایێن فلزی ل چیا دەرکەڤن ؟




نەخشەی دابەشبوونا کانزا ل عێراقێ

## پێنج / رێکێن هاتن و چوونێ وبازرگانی :-

بازرگانی ژ ئەنجامێ هەبوونا رێکێن هاتن و چوونێ دەرکەڤن ژ لایەکی ڤە، وهەبوونا بەرهەمێ زێدە ل دەڤەرەکێ و نەبوونا وی ل دەڤەرەکا دی یا وەلاتی دبێتە ئەگەرێ پەیدابوونا بازرگانیا ناڤخۆ ، و ئەگەر پێ گهورین ژ سنورێ وەلاتی دەر بازبوو دبێژنێ بازرگانیا ژ دەرڤە.

### ١- رێکێن هاتن و چوونێ :-

رێکێن هاتن و چوونێ مەلبەندێ پێشکەفتنا ئابووری وکومەلایەتیە ژ بەر زێدەبوونا پەیوەندییا د ناڤبەرا هەموو بەشێن وەلاتی کو ل بەرێ گەهشتن بۆ ڤان دەڤەران گەلەکا ب زەحمەت بوو ، ورێکێن هاتن وچوونێ ل عیراقێ سێ بەشن .

**أ- رێکێن هشتکاتیێ :** کو پێك دهێت ژ رێکێن ترومبێلان کو ل دەڤەرێن دەشتایی بهایێ چێکرنا وان یا کێمە . ئەگەر بەراورد بکەین لگەل رێکا ترومبێلا دەڤەرێن چیایی ژبەر سروشتیا ئەردی ، کو د ئەنجامدا رێك درێژتر دبن .

> **پرسیار :**
> مەسرەفێ رێکێن هاتن وچوونێ ل دەڤەرێن چیایی یا زۆرە ؟

### گرنگترین رێکێن ترومبێلا ل عیراقێ ئەڤەنە :-

١- رێکا بەغدا - کوت - عەمارە - بەسرە.

٢- رێکا بەغدا - حلە - دیوانیە - سەماوە - ناسریە - بەسرە.

٣- رێکا بەغدا - رومادی - حەدیثە - قائم .

٤- رێکا بەغدا - رومادی - روتبە .

٥- رێکا بەغدا - تکریت - میسل - دهوك .

٦- رێکا بەغدا - بەعقوبە - خانەقین .

٧- رێکا بەغدا - کەرکوك - هەڤلێر .

٨- رێکا بەغدا - کەرکوك - سلێمانی .



**نەخشێ رێکێن ترومبێلان ل عیراقێ**

## پرسیار

١- بۆچی بازرگانی پەیدابوو ؟

٢- بۆچی رێکێن هاتن و چوونێ دگرنگن ؟

رێکێن دەڤەرێن دەشتێن نیشتەنی و بانیا روژئاڤا مەسرەفێ وان کێمە ؟ بۆچی ؟

هەر وەسا رێکێن شەمەندەفرا هەنە کو دەسپێدکەن ژ .

١- بەغدا - تکریت - میسل - رەبیعە .

٢- بەغدا - حلە - دیوانیە - سەماوە - ناسریە - بەسرە .

٣- بەغدا - رومادی - حەدیثە - قائم - عەکاشات .

٤- حەدیثە - بێجی - کەرکوك

## ب- ریکێن ئاڤێ :

رووبارێ دیجلە ل ناڤ کوردستانێ ب کێر هاتن و چوونێ ناهێت ژبەر نشیڤیا دەڤەرێ و لەزاتیا ئاڤاوێ ، هەر وەسا رووبارێ فورات ژ نهالەکا تەنگ را دبورت ل دەڤەرا بانیا روژئاڤا ژبەر وێ چەندێ هاتن وچوون تێدا ناهێتەکرن ، بەلێ هەردوو رویبار ل باشورێ بەغدا ب کێر هاتن و چوونێ دهێن . بەلێ پاپۆرو بەلەمێن بچووك هاتن وچوونێ تێدا دکەن . وشەت وئەلعەرەب دا پاپۆرێن جورێ ناڤنجی دشێن دناڤدا ب بۆرن .

## ج- ڤەگوهاستنا ئەسمانی :

کۆمەکا هێلێن هاتن وچوونا ئەسمانی ل عیراقێ هەنە ؟

١- بەغدا

٢- هەولیر

٣- سلێمانی

٤- بەسرە

٥- مووسل

**پرسیار :**

١- بۆچی رویبارێ دیجلە ل هەرێما کوردستانێ ب کێر هاتنو چوونێ ناهێت؟

## ٢- بازرگانی

### بازرگانی ل عیراقێ دو جۆرن :

أ- بازرگانیا نافخۆ : ژ ئەنجامێ جۆراو جۆریا بلندی ونزمیا ئەردێ عیراقێ ب باش بەرچاڤ دبیت  ئەڤێ ژی کار کریە سەر جۆرا وجوریا بارێ ئاڤ وبای و هەمی رەنگیا بەروبورمێ ئاژەل و چاندنێ ، دئەنجامدا بازرگانیا ناڤخۆ پەیدابوویە.

ژبلی وێ ژی بازرگانیا ب هێز دناڤبەرا گوندو باژێران ل هەمی دەڤەرێن عیراقێ ژ لایەکێ و بازرگانیا ب هێز دناڤبەرا باژێرێن عیراقێ و پایتەختی ژ لایەکێ دیڤە هەنە ژ ئەنجامێ هەبوونا پتریا پیشەسازیا ل ڤی باژێری .

هەر وەسا بازرگانیا نافخۆ دناڤبەرا باژێرا و گوندان هەیە بۆ گوهرینا جل و بەرگا ( عەرەبی و کوردی ).







وێنێ پاپورێ  وفروکێ و شەمەندەفرێ

**ب – بازرگانیا ژ دەرڤە :** ئەڤ بازرگانیە دناڤبەرا عیراقێ و ولاتێن دەور و بەرێن وێ هەیە ب هەمی جورێن رێکێن ڤەگوهاستنێ ب تایبەتی ڤەگوهاستنا هشکاتی ، کۆ بۆ ڤەگوهاستنا تشتێن دروست کری پێ ئەنجام دەن . وڤەگوهاستنا خارنێ ب هەمی جۆرێن وان دناڤبەرا ئیران و تورکیا و سوریا دگەل عیراقێ ب هەمی رێکێن نیڤ دەولەتی ئەنجام  ددەن . ژبلی رێکا هشکاتییێ ژی ، بۆرییێن نەفتێ و گازا سرۆشتی دناڤبەرا کانییێن نەفتێن عیراقێ وبەندەرێن دەریا ناڤەراست ل سوریا وتورکیا زێدەبارێ بەندەرێن عیراقێ کو ل وێرێ بەرەف جیهانێ ب پاپۆرێن تایبەت یێن ڤەگوهاستنا نەفت و گازێ ب جۆرێ (پاپۆرێن مەزن ) دچت .

هەر وەسا ڤەگوهاستن ب شەمەندەفرێ هەیە کو ب کێر مفایێ بازرگانیا نافخۆ دهێت ب تایبەتی ڤەگوهاستنا بەرهەمێ چاندنێ د ناڤبەرا دەڤەرا نیمچە چیایی و دەشتا لیتەیی  ل بەسرا بەرەف بەغدا و مووسل و دەڤەرێن دێ .



دیمەنێ بەندەرەکی

## ئاكنچیبوون

ژمارا ئاكنجیان ل عیراقێ بەردەوام د زێدەبوونێ دایە ل سالێن پشتی ١٩٢٧ز هەتا كۆ نهۆ ول سەرژمێریا ١٩٥٧ز ژمارا ئاكنجیێن عیراقێ گەهشتە (٦٤٩٥٠٠٠) كەسان بەلێ ل سالا ١٩٧٧ز گەهشتە (١٢١٧١٠٠٠) كەسان ول سالا ١٩٨٧ز چریا ئاكنجیێن عیراقێ (٢٨كەس ) بوون كم٢ ، بەلێ ئەڤ چریە ل هەمی دەڤەرا وەكی ئێك نینە ل دەڤەرا بیابانی كێمترە ول چیایێن بلند ئاكنجی دكێمن بەلێ ئاكنجیێن دەشتان كەلەك زێدەترن ، نموونەك بلندی ژ چریا ئاكنجیان ب دیار دەردگەڤت ل ڤان خالێن خارێ :-

**چریا ئاكنجیا ل دیف دەڤەرێن جودا جودایێن عیراقێ :**

١- **دەڤەرا چریا زۆر بلند :** پارێزگەها بەغدا ڤەدگەریت كو چریا وێ ١٠٨ كەسن /كم٢.

٢- **دەڤەرا چریا زۆر :** ل پارێزگەها بابل ب چریا ٦٣ كەسان / كم٢ .

٣- **دەڤەرا چریا ناڤنجی ( ناوەند):** پارێزگەها كەركوك و بەسرە و دیوانیە و ناسریە و سلێمانی و هەڤلێر و دهۆك و میسل كو چریا ئاكنجیان د ناڤبەرا ( ٣١- ٥٣ ) كەسان /كم٢.

٤- **دەڤەرا چریا كێم :** كو چریا وێ دناڤبەرا (١٥- ٢٣) كەسا / كم٢ پارێزگەها كوت و عەمارە و سلاحەدین و نەجەف .

٥- **دەڤەرا چریا زۆر كێم :** كۆ چریا ئاكنجیان دناڤبەرا (٤-٥) كەسا كم٢ ل پارێزگەها رەمادی و كەربەلا و سەماوە كو دكەڤیتە بانییا رۆژئاڤا عیراقێ.

ئەگەرێ چریا زۆریا ئاكنجیان ڤەدگەریتەڤە بۆ هەبوونا پارەیەكێ زۆر بۆ (پەیدابوونا پیشەسازی وبازرگانی و دامەزراندنا كومپانیان بۆ بازرگانیا گشتی هەر وەسا هەبوونا چەندەها فەرمانگەهێن میری و ..... یێن دی تر . كۆ دبیتە ئەگەرێ خربوونا ئاكنجیان ل ڤان باژێران ) . بەروڤاژیا ئەوان دەڤەرا كو ئاكنجیێن وان دكێمن .

## پێكهاتنا ژی و رەگەزێ ئاكنجی

## گرنگیا ناسینا پێكهاتنا ژیی یا گرنگە بو زانینێ

### ١- ژیێ بچووک ( زارۆک ) ژ دایک بوونێ هەتا کو (١٤ سالٚ) :

كۆ ژیێ ب خودانكرنێ یە و رێژاوان ل عیراقێ ٤٥٪ سەرجەمێ ئاكنجیێن عیراقێ پێك دهینت ،ئەڤ ژییە پێدڤی ب ئاگەهداریا خواندن و فێركرنێ و ساخلەمیێ هەیە ژلایێ دەزگایێن میری ڤە .

### ٢- ژیێ ناڤنجی ( ناوەند) (١٥-٦٤)سالٚ :

ئەڤ ژییە ژیێ كاركرنێ و وەراركرنا ئاكنجیانە كۆ ئەگەرێ زیدەبوونا خەلكییە ل هەر وەلاتەكی رێژا وان ل ناڤ جڤاكی دگەهشتە ٤٢٪ ژ ئاكنجیان زێدەبوونا ئارێشەیا مشەختبووی بەرەڤ دەرڤەیا ولاتی دناڤ ئەڤێ دەستەكا تەمەنی دا هەیە كۆ پشتی سالێن ١٩٨٠ز پەیدابوو . ل دەمێ شەرێ عیراقێ وئیرانێ وشەرێ كویتێ ول سالا ١٩٩٠زێدە دۆرپیچكرنا ئابوری ل سەر عیراقێ زیدەتر لی هات، ئەگەرێ كێمبوونا كرێكاران و كێمبوونا ژیێ وەراركرنا ئاكنچیێن عیراقێ .

٣- ژیێ مەزن (٦٥سالٚ و زێدەتر ):

کۆ رێژا وان دناڤبەرا (٤-٧٪) ژ ئاکنجیێن عیراقێ نە ئەڤەژی پێدڤی ب چاڤدێرییێنە هەر وەسا بارێ ساخلەمیا وان پاشکەفتیە و خرابە ، بەلێ ئەڤ ژمارە هەتا رادەکی تمام نینن ب تایبەتی خەلکێن ژیێ کارکرنێ (١٥-٦٤)سالٚ ، ژبەر وێ کو پترییا ژنا ل مالێ دروینشتینە بێ کارکرن بارێ ب خودانکرنا وان دکەڤیتە سەر دەورووپشتێن وان .

## پێکهاتنا رەگەزێ ئاکنجیێن عیراقێ:

مەرەما مە ژڤێ پێکهاتنێ نیاسینا ژمارا نێر ومێ یانە ژ ئاکنجیێن عیراقێ.

ب شێوەکی گشتی ژمارا کچان ژ کوران زێدەترە ژ ئەنجامێ :

١- هەبوونا شەرێ عیراقێ وئیرانی و پشتی هینگێ شەرێ کویتێ کو بویە ئەگەرێ ژناڤچوونا رێژەکا زۆر ژ رەگەزێ نێر ل عیراقێ .

٢- مشەختبوونا پترییا رەگەزێ نێر ل عیراقێ چ ژ بەر مەترسیا شەری یان ژبەر لێگەریان ل دیف ژیارەکا خۆش تر و ئارامتر ژ دەرڤەی عیراقێ .

٣-هەر وەسا هۆکارێ بیالۆجی کار دکتە سەر زارۆکێ ژدایک بووێ نێر زیدەترە ژ مێیان و لەشێ وان ب هێزترە ، زارۆکێ نێر زیدەتر ژ مێیان ل تەمەنێ کێمتر ژ سالەکێ توشی نەخۆشیان دبیت .

٤- گەلەك ژ ئامارا ژمارەکا تمام تێدا نینە ، ژبەر نەدانا پێزانینێن تمام هەر ژلایێ خیزاناڤە ژبەر مەترسیا تووشبوونا کورێن وان ل بەر خزمەتا سەربازی .

**چالاکی:** گرۆپەك ژ قۆتابیان بەلاڤۆکەکا سەر دیواری ئامادەبکەن دەربارەی ( ئاکنجیبوون) وکیشێن وان ل عیراقێ .




نەخشێ كارگێریێ عیراقێ

## وەراركرنا ئاكنجیێن باژێران

**باژێر ل عیراقێ ب گشتی د وەراركرنێ دانە ژ ئەنجامێ :-**

١- مشەختبوونا ئاكنجیێن گوندان بۆ باژێران ب تایبەتی ل باژێرێ هەولێر و دهۆك وسلیمانییێ ئەڤەژی ژ ئەنجامێ كۆمەكا هۆكارانە :

٢- تێكدانا گوندا ژلایێ حكومەتا ئەوی سەردەمی ڤە ب هێجەتا هاریكاریا وان بۆ پێشمەرگە .

٣- هەبوونا جوداهیەكا زۆر دناڤبرا باژێر و گوندان ژ ئەنجامێ هەبوونا گەلەك جۆرێن كاری ل باژێران بەروڤاژیا گوندان .

٤- هەبوونا هەمی جۆرێن خزمەتگوزاریێ (ئاڤا پاقژ و بنگەهێ ساخلەمیێ و قوتابخانە ویێن دی تر ).

لڤێرێ پێدڤیە ئەڤ بەرفرهەبوونا باژێـران رابوستیت ، ب شێوەکی کو باژێـر ژ شێوێ شارستانیەتا خۆ بمینت بڤان خالێن خوارێ:

١- راگرتنا بەرفرهەبوونا باژێـران ب دامەزراندنا کەمەرەیەکا کەسك ل دەورو پشتێن باژێـران ب مەرەما راگرتنا بەرفرهەبوونا ئاسوویی .

٢- دامەزراندنا باژێـرین نوو ل دیڤ پێدڤی یان ب تایبەتی باژێـرێن پیشەسازی، و هۆیێن دامەزراندنا پیشەسازی یان نێزیك بازاری یان کەرەستێ خاڤ یان هەر دەڤەرەکادی.

٣- بەرفرهەکرنا باژێـران بەلێ ب شێوەکێ ستوونی ب دامەزراندنا (شوقێن ئاکنجیبوونێ ).

٤- دامەزراندنا دەڤەرێـن خۆجهبوونێ ل دەوروپشتێن باژێـران بەلێ ب شێوێ نەخشەکێشانێ .

**پرسیار :** بەرفرهەبوونا روبەرێ باژێـران ب شێوێ ئاسوویی بۆ ئەڤی سەردەمی زۆر گونجای نینە ، بۆچی ؟

## چەمكێ كوردستان :

كوردستان وەك ناڤێ هەرێمەكێ و زاراڤەكێ جوگرافی بۆ جارا ئێكێ ل سەردەمێ سەلجوقیان ، ل ناڤەراستا چەرخێ دوازدێ بكار هاتیە ( سەنجەر)ێ دووماهیك سولتانێ سەلجوقییان ئێكەم كەس بوو كو ئێك ژ هەرێمێن وەلاتێ خۆ بناڤێ كوردستان بناڤكری ، و گەریدەیی بناڤو دەنگێ ئیتالی ئێكەم كەس بوو كو ناڤێ كوردستانێ تومار كری وب ( كاردستان ) ناڤبری .

پشتی پەیدابوون وبەلاڤبوونا زاراڤێ كوردستان دبینین هەمی ڤەكۆلەر و نڤیسەر و دەزگەهێن زانستی لسەر وێ چەندێ ئیكن كو مەرەم ژڤی زاراڤی ئەرد وەلاتێ كوردانە .

ل دەمێ دروستبونا دەولەتا عیراقێ وپشتی شەڕێ جیهانی یێ ئێكێ ، زاراڤێ عێراق ژلایێ كارگێری وسیاسی ڤە هاتە بكارئینان هەمی وێ ئاخێ ڤەدگریت كو كەڤتە بن دەسهەلاتا دەولەتا عیراقێ و دگەلدا بەشێ باشورێ كوردستانێ كو هاتیە بناڤكرن ب هەرێما كوردستانێ ، ئەوا پەیوەندی ب زاراڤێ (هەرێم) ڤە هەی ژلایێ جوگرافی ڤە : ئەو پارچا ئەردی یە یا كو دیاردەك یان چەند دیاردێن جوگرافیێن وەكی ئێكە هەتا وێ رادێ وێ پارچا ئەردی وەلێ دكەت تایبەت مەندیەكا هوسا هەبیت ژپارچێن دەوروبەر جودا بكەت ، سەبارەت هەرێما كوردستانا عیراقێ دبینین ژمارەكا تایبەتمەندیێن جوگرافیێن هوسا هەنە وەلێ دكەن كو كوردستانا عیراقێ هەرێمەكا جوگرافیا جودابیت، ژ وانا پلا ئێكێ هەرێمەكا مرۆڤی یە وەلات و ئەدرێ كوردانە و پتریا ئاكنجیێن وێ كوردن ، ژلایێ بلندی ونزمیا ئەردی ژ هەرێمێن دی یا جودایە ،

ژبەر کو نەهالێن کویر گرو دەشتێن بەرفرەهـ وزنجیرا چیایێن بلندیێن هەین ، هەر وەسا ئێکەمین هەرێما عیراقێ یە کو ئاڤ و هەوایەکێ شهدار و نیمچە هشکاتی یێ هەی ، ژلایی گیاو رووەکێ خورسك ، وتەیرو تەوال وگیانەوەرێن کویڤی وئاڤاێن بن ئەردی وسەر ئەردی دەولەمەندترین هەرێما عیراقێ یە ، ئەڤجا هەرێما کوردستانا عیراقێ ژئەگەرێ تایبەتمەندیێن مرۆڤ وسرۆشتی هەرێمەکا جوگرافی یا جودایە ژ هەرێمێن دی یێن عیراقێ .

## سنۆرێ جوگرافییێ هەرێما کوردستانا عیراقێ:

سنۆرێ رۆژهەلات و باکور و باکورێ رۆژئاڤایا هەرێما کوردستانا عیراقێ سنۆرەکێ نیڤ دەولەتی یە دگەل هەر ئێك ژ دەولەتێن ئیران و تورکیا وسوریا، بەلێ سنۆرێ باشورێ رۆژئاڤا هەتا نوکە دەستنیشان نەکریە ، ودڤی بواریدا بزاڤێن زۆر ژلایی ڤەکۆلەراڤە بۆ دەستنیشانکرنا سنۆرێ هەرێمێ ، بشت گرێدان ب پیڤانێن توبوگرافی و مێژوویا خەلکێ هەرێمێ وپشت گوهـ خستنا پرۆسێن ئاکنجیکرنا هوزێن عەرەبا و هەولێن تەعریبکرنێ پشتی دامەزراندنا دەسهەلاتا نافخۆیی ل عیراقێ ، وەسا دیاربوو کو سنورێ هەرێمی ل رەخەکێ عیراقێ باشورێ رۆژهەلاتێ باژێرکێ بەدرە ل پارێزگەها واست دەست پێ دکەت ، وبەرەف باکور هەتا کانیێن نەفتێ ل رۆژئاڤاییێ باژێرکێ مەندەلی دهێت ، وبرەخ بلنداهیێن حەمرین هەتا فەتحە دچیت ومل بملێ رووبارێ دیجلە سەردکەڤیت ول باکورێ باژێری موسل بەرەف باشوری رۆژئاڤا دزڤریت وبولایێ باژێرکێ حەزەر پاش بەرەف رۆژئاڤا هەتا دگەهتە سنۆرێ عیراق – سوریا ل باکورێ باژێرکێ بەعاج .

رۆبەرێ هەرێمێ نێزیکی ٩٠,٠٠٠ کیلومترێن دوجارکی دبیت کو دگەهتە زێدەتر ژ ٢٠٪ ێ ژ سەرجەمێ رۆبەرێ عیراقێ ، بڤی شێوەی هەرێم دناڤبەرا هەردو بازنێن پانی (٣٣ – ٣٧ ) باکورێ هێلا یەکسانی دایە ، ودناڤبەرا هەردو هێلێن درێژ (٤١ –٤٦) رۆژهەلاتێ هێلا گرینج دایە .




نەخشێ هەرێما (کوردستانا عێراقێ )

## بلندی و نزمیا رویێ ئەردێ هەرێما کوردستانێ

جهێ جوگرافیێ هەرێما کوردستانا عیراقێ کارێ کریە سەر سیمایێ بلندی و نزمیا روی ئەردی وئاخاوێ ، ئەڤەژی روالەتەکێ وان هۆکارێن جیولۆجیە کو ئێك ل دویڤ ئێك بسەر ئەڤێ ئەردی داهاتین ، دکەڤندا ئەڤ دەڤەرە بەشەك بوو ژ دەریایا (تیش ) یا کەڤن ، پرۆسا سەرئاڤکەفتنا وێ ب ژمارەیەکا جولاندنێن بلندێن تەکتونی دەست پێکریە و ملیۆن سالان ڤە کێشایە ، وئەڤ جولانێن بلند ونزمێن سەر ئەردی لێ پەیدابوون .

دشێین ئەڤێ پارچێ هوسا وەسف بکەین کو پێکهاتیە ژ چەپێن کوور کو چەمیایی و نەهالێن کوور دکەڤنە دناڤدا ، ئەڤ چەپ چەمیانە ب شێوێ شوربونێ وەرگرتیە کو ل باکورێ رۆژئاڤا هەرێمێ بەرەڤ رۆژهەلات دچیت وپاش بەرەف باشورێ رۆژهەلات شوردبنەڤە ، ئەڤجا رویێ ئەردێ هەرێما کوردستانێ یێ جودایە ژلایێ بلندی ونزمی ژبەر هندێ دشێین دابەش بکەین بۆ دوبەشێن سەرەکی :

١- دەڤەرا جیایی .

٢- دەڤەرا زویرک ( نیمچەچیایی )

### ١- دەڤەرا چیایی :

ئەڤ دەڤەرە باکورێ هەرە دویرێ باکورێ رۆژهەلاتا هەرێما کوردستانێ ڤەدگریت ، چیایێن ئەڤێ دەڤەرێ د بلند و سەرتیژن و بلنداهیا وان دناڤبەرا (١٠٠٠ – ٣٦٠٠ م) وپتریا چیایێن ئەڤی بەشی ب چەپێن چەمیای و رێك

هاتینه نیاسین . دشێین دەڤەرا چیایی لسەر بنەمای بلندی وپێکهاتنا جیولوجی بکەینه دو زنجیرێن چیایی .

**أ – زنجیرا چیایێن بلند و چەمیایی و ئالۆز :** ژ باکورو باکورێ رۆژهەلاتی کو بلندیا وان دناڤبەرا ٢١٠٠ – ٣٦٠٠ مەترن ، جەپێن ئەڤێ دەڤەرێ زۆریا گوپیتك و ژێهەلی و ژووردانیێن رك هاتینه نیاسین ،گەلەك جاران چەپێن وێ لێك نزیك دبن . وچیا بەرفرەهدبن ، بڤێ چەندێ نهالێن چیایێن مەزن گەلەك تەنگ دبن ، ئەوتشتێ رکاتیا دەڤەرێ زێدەکری توندیا هۆکارێن هریانێنه ژئەگەرێ باران وبەفرێ ، ژچیایێن ڤێ دەڤەرێ چیایێ مەهرنار وئاشینه و سەرمەیدان لسەر سنۆرێ عیراق و تورکیا ، وچیایێ حەسارۆست کو بلنداهیا وی ٣٦٠٧مترا پترە و چیایێ قەندیل و هەورەمان لسەر سنۆرێ عیراق و ئیرانێ .

**ب- زنجیرا چیایێ چەپێن سادە :**

ئەڤ دەڤەرە دکەڤیتە باشورێ دەڤەرا ئێکێ بلنداهیا چیایێن وێ دناڤبەرا (١٠٠٠– ٢١٠٠) مترە ، ئەڤ دەڤەرە ب کێمیباچەپ و چیرێ، بەرینێ دهێتە نیاسین، دگەل وێ چەندێ چیایێن ڤێ دەڤەرێ کەفتینە بن کاریگەریا هریان وژێکڤەبوونێ ، بەلێ زنجیرا چیایێن دەڤەرێ بشێوەکێ رونتر دەردکەڤن ، زنجیرا چیایێن ڤێ دەڤەرێ کو سنورێ باشورێ دەڤەرێ دیار دکەن ئەڤەژی دەڤەرا زویرك جودادکەت ژ زنجیرا چیایێن وێ بێخیر ، سەفین ، هەیبەت سولتان ، قەرەداغ ، زەردەداغ ، هەروەسا ژمارەکا بانییان بخوڤەدگرن .

وبانيیا پێنجوین کو دکەڤیتە باکورێ پارێزگەها سلێمانییێ مەزنترین و گرنگترین بانییا دەڤەرا چیاییە .
وبانییا ( بەرزنجە ) ل رۆژهەلات دگەهیتە چیایێ هەورامان ول باشوری هەتا دەشتا شارەزور درێژدبیت .

## ٢- دەڤەرا زویرك ( نیمچە چیایی ) :

سنۆرێ دەڤەرێ ل باکور سنورێ دەڤەرا چیاییە بەلێ ل باشوری دگەهتە چیایێن شنگال ، شێخ ئیبراهیم ، مەکحۆل و زنجیرا چیایێن حەمرین . رویێ دەڤەرا بانی و گرکا پێکهاتیە ژ زنجیرەکا چیایێن نزمێن وکەهەڤ ، وکۆمەکا باش و دەشتێن بەرفرەهـ کو ل ناڤبەرا زنجیرا چیا وبانییان درێژ بوینە .
ژئەگەرێ جوداهیا زۆرا سروشتی بلندی ونزمیا دەڤەرێ دشیێن رویێ وێ دابەش بکەین بۆ سێ بەشان :

### أ- زنجیرا چیا وگرکان :

ب شێوێ چەند کومەکا دەردکەڤن کو ژلایێ باکورێ رۆژئاڤا بەرەڤ باشورێ رۆژهەلات درێژ دبن وپتریا زنجیرێن بلند ژ ١٠٠٠ مترا نابوریت د ئاسێ نینن وترویتن و بێ رووەکن وکێم چەمیاینە و زێدەتر گرکان دچن نەوەك چیانە .
ژ زنجیرێن ڤێ دەڤەرێ حەمرین ، مەکحول ، درەوشکە ، کانی دوملان ، وقەرەچوغ.

**ب - دەشت :**

دەشتێن ئەڤێ دەڤەرێ ب راستی پێکهاتینە ژ چەمیایی و بلنداهیان هۆکارێن خوارن و رامالینێ یێن پرکرین ژ چینەکا ستیر یا نیشتەنی لم . هندەك ژوان باشترین و چێترین دەشت بۆ چاندنێ دهێن ژوان ژی : دەشتا هەڤلێرێ ، دەشتا شنگالێ و دەشتا حمرین .

**جـ- بانی :**

ئەڤێ دەڤەرێ روبەرەکێ بەرفرەهـ ژ بانیان و گرگا یێن تێدا وەکی مە ئاماژە پێ دای چەمیایی پتر ب گرگا ڤەدچن و ژێك دویرن و رك و ئاسێ نینن . ژ گرنگترین بانێن ئەڤێ دەڤەرێ بانییا کەرکووکێ و بانیا مووسلە .




نەخشێ روویێ ئەردێ هەرێما کوردستانێ

## ئاڤ و هەوایێ هەرێما کوردستانا عیراقێ

ئاڤ و هەوایێ هەر هەرێمەکێ دکەڤیتە ل بن کارتێکرنا کۆمەکا هۆکارا و ل دویماهیێ کارتێکرنا وان دیار دبیت ل سە سالوخەت وتایبەتمەندیێن ئاڤا و هەوایێ وێ . ئەڤجا بۆ زانینا سەقایێ هەر هەرێمەکێ پێدڤییە ئەم وان هۆکاران بەحس ژێ بکەین ئەوێن کارتێکرن ل سەرکری .

و ئەویا پەیوەندی ب هەرێما کوردستانا عیراقێ ڤەهەی ئەڤ هۆکارێن ل خواری گرنگترین هۆکارن کۆ کارکریە سەر سەقایێ هەرێما کوردستانێ .

### ١- جه ل دویڤ بازنێن بانیێ :

هەرێم دەکڤیتە د ناڤبەرا بازنێنپان یێن بانی (٣٣ – ٣٧) پلا ل باکور ، ئەڤ جهە حەتا رادەکی گەلەك بەرپرسە ژ :

أ- نەوەك هەڤیەکا مەزن بۆ بلندترین پلا گەرمێ و نزمترین پلا گەرما سالانە .

ب- دەرکەفتنا هەر چار وەرزێن سالێ ب تایبەتی ل دەڤەرێن چیای .

جـ- دەرکەفتنا دیاردا بارانێن وەرزی ( باران بارین ل نیڤا زفستانا سالێ و هاڤینا هشك ).

### ٢- جه ل دویڤ دەریا و زەریان :

هەرێما کوردستانا عیراقێ جهەکێ کیشوەرێ یێ دویر ئاڤێ یە ئەڤجا کارتێکرنەکا بهێز ل سەر کەش و هەوایێ هەرێمێ دکەت ، کو تێکرا ( مەزناهیا هێزا گەرما سالانە و رۆژانە و کێم باران و کێم رادا شهێ یا بەرنیاسە . د ناڤ رووبەرێن ئاڤێدا دەریایا ناڤەراست کارتێکرنا ل سەر سەقایێ هەرێمێ هەی .

### ٣- بلندی ونزمیا رویێ ئەردی :

دابەش بونا رویێ ئەردێ هەرێما کوردستانێ ل سەر چەند یەکەیێن بلند و نزم ( دەڤەرێن چیایێ و نیمچە چیایی ) و ب لایێ درێژبونا زنجیرا چیایێن سەرەکی ژ باکورێ رۆژ ئاڤای بەرڤ باشورێ رۆژهەلات، ب شێوەکێ ئاشکرا کارکریە سەر سەقایێ هەرێمێ ، ئەڤەژی بویە ئەگەرێ پەیدابونا جوداهیەکا زورا گەرمێ ل دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دیتر ب تایبەتی ل وەرزێ زفستانێ ، هەروەسا جوداهیەکا زۆر ژ باران بارینێ پەیداکریە ژبلی جوداهیا جورێن دابارینێ (بەفر ئان باران)

### ٤- نزماهییێن سەقای ( نزمێن کەش و هەوای ) :

ئەو نزماتییێن هەوای کو د هەرێمێدا دبورن ژ لایێ ژمارە و جورانڤە کارەکێ مەزن دکەنە سەر کەش و هەوایێ هەرێمێ ، برا باران بارینێ و وەرزێ دابارینێ ، درێژاهیا ماوێ بارینێ ، ئاراستا بای حەتا رادەکێ زور پشت ب ڤان نزماهیان ڤە گرێدایە ، هەر وەسا دیاردا زوری و کیمبونا برّا باران بارینان سالانە و هەیڤانە دزڤریتە ڤە بو هەبوونا جوداهیەکا زۆرا مەزن ژ ژمارەو جۆرێن نزماهیێن سەقای کو ل هەرێمی د دبۆرن.

### ٥- پیلێن بای ( الكتل الهوائية ) :

هەرێما کوردستانا عیراقێ توشی پێلین بای یێن ژێك جودا دبیت د وەرزێن جودا جودا دا ، کو یێن سارو هشك وکێم شهـ هەنە ، هندەك ژی گەرم و شهدارن .

## بارو دۆخێ ئاڤ و هەوای ل هەرێما كوردستانا عیراقێ :

گومان تێدانینە كو باو گەرمی دبارین ژ گرنگترین رەگەزێن ئاڤ و هەوای دهێنە هژمارتن ، ئەڤان رەگەزان دێ چەندەك ب درێژی بەحسی ژێ كەین .

### ١- با ( الریاح ) :

ل هەرێما كوردستانێ ئاراستەیا بایێن بەرنیاس دوبارە بوونا وان ل وەرزەكێ بۆ وەرزەكێ دیتر بایێن بەرنیاس یێن زڤستانێ وبهارێ پێكهاتینە ژ :

بایێ باكورێ رۆژهەلات ، بایێ باشورێ رۆژهەلات و بایێ باشور . وبایێ بەرنیاس ل وەرزێ هاڤینێ پێكهاتینە ژ بایێ رۆژئاڤا ، بایێ باكورێ رۆژئاڤا و بایێ باكور .

سالوخەتێن ئەوبایێن كو ب سەر هەرێمێدا دهێن جوداهیا ل دویڤ جوداهیا ئارستە وئەو ژێدەرێن كو ژێ دهێن ، بایێ باكورێ رۆژهەلات شهدارە و گەرمە . ئەو بایێ ژ رۆژئاڤای ل وەرزێ هاڤینێ دهێت بایەكێ هشكە و گەرمە هندەك جارا توز دگەلداهەیە .

ل هندك دەڤەرێن چیایێن هەرێمێ بایێ خۆ جهی ب سەردادهێت وەكی باهینكێ چیا و نهالا و رەشە باو ب سەر گۆما سلیمانیێ دا دهێت .

### ٢- گەرمی:

تێكراییا گەرما هەرێمێ ل دەڤەرەكێ بۆدەڤەرەكا دی و ژ وەرزەكێ بۆ وەرزەكێ دي یێ سالێ جودای هەیە ژ بەر كو تێكراییا پلا گەرما دەشتان جودایە ژ یا چیایان ئویا وەرزێ زفستانێ جودایە ژ وەرزێ هاڤینێ دێ ل خارێ دەربارەی گەرما هەر ئێك ژ وەرزێن زڤستان و هاڤینان ل هەرێمێ دێ ڤەكولینێ ل سەر كەین .

## باریٚ گەرمیٚ ل وەرزیٚ زفستانیٚ:

تیٚکراییا گەرما هەیڤا کانونا دوویٚ کو سارترین هەیڤا سالیٚ یە دهەریٚمیٚدا ل ناڤ بەرا (١-٣ ) پلا سەدیە ل ویستگەهیٚ سەلاحەدین و ٩,٩ پلا سەدیە ل خانەقین، ب گشتی چەند بەرەف باکور و باکوریٚ روٚژهەلاتا هەریٚمیٚ ڤە بچین پلا گەرمیٚ دهیٚتە خاریٚ ژبەر دوو ئەگەران :

**ئیٚک :** چەند بەرەف باکور و باکوریٚ روٚژهەلاتی ڤە بچین ئەرد بەرز و بلندبیت.

**دوو :** لاییٚن باکوریٚ هەریٚمیٚ دکەڤنە وان دەڤەران ییٚن کو ژ کەمەرا ئەردی د دویرن، دبیتە ئەگەریٚ کورتیا روژیٚ د نیڤا زڤستانا سالیٚدا و کیٚمبونا کەفتنا گوٚشا تیروٚژکیٚن هەتاڤیٚ .



دیمەنەک وەرزی زفستانی دیار دکەت

## بارێ گەرمێ ل وەرزێ هاڤینێ :

کێمیا خواربوونا کەفتنا گۆشا تیرۆژکێن تاڤێ ، هەروەسا رۆژێت درێژ و ساهیا ئەسمانی و پێلەکا بای کو ڤی کیشوەرێ هشك د ڤی وەرزیدا هەرێمێ ڤەدگریت، هاریکاریێ بۆ بلندبونا پلێن گەرمێ دکەن :

د پتریا دەڤەرادا ژ (٣٠) پلا سەدی پترە .

ئاڤ و هەوایێ هەرێمێ ژلایێ گەرمێ ڤە تایبەتمەندیەکا دی یا هەی ئەوژی تایبەتمەندیا ئاڤ و هەوایێ کێشوەریە کو ب هەبوونا جوداهیەکا گەرما زۆرا گەرما سالانە دیاردبت ژ(٢٥) پلا سەدی پترە ل هەمی ویستگەهێن هەرێمێ سەحکە خشتێ ژمارە (١) .



دیمەنەکێ ژ وەرزێ هاڤینێ دیاردکەن

## خشتێ ژمارە (١)

تێکراییا پلا گەرمێ یا هەیڤانە وسالانە ل چەند ویستگەهێن هەرێمێ وپلا سەدی

| هەیڤ/ ئیسگەهـ | شەنگال | سەلاحەدین | سلێمانی | کەرکوك | خانەقین |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| کانوونا دووێ | ٦,٢ | ٣,١ | ٣,٢ | ٨,٤ | ٩,٩ |
| شوبات | ٨,١ | ٤,٩ | ٥,٣ | ١٠,٢ | ١١,٥ |
| ئادار | ١٢,٢ | ٩,١ | ١٠,٢ | ١٣,١٧ | ١٥,٥ |
| نیسان | ١٦,٩ | ١٤,١ | ١٥,٣ | ١٩,٢ | ٢٠,٥ |
| گولان | ٢٣,٩ | ٢٠,٢ | ٢١,٣ | ٢٦,٣ | ٢٧,٥ |
| خزیران | ٣٠,٤ | ٢٦,٢ | ٢٨,٦ | ٣٢,٢ | ٣٢,١ |
| تیرمەهـ | ٣٣,٨ | ٣٠ | ٣٢ | ٣٥,٢ | ٣٥ |
| ئاب | ٣٣,٧ | ٣٠,٢ | ٣١,٩ | ٣٤,٧ | ٣٤,٨ |
| ئیلۆن | ٢٩,٣ | ٢٦,١ | ٢٧,٥ | ٣٠,٤ | ٣٠,٤ |
| چریا ئیکێ | ٢٢,٦ | ١٩,٤ | ٢١,١ | ٢٤ | ٢٤ |
| چریا دووێ | ١٤,٩ | ١١,٥ | ١٢,٨ | ١٦,٦ | ١٦,٣ |
| کانوونا ئیکێ | ٨,٢ | ٥,٥ | ٦,١ | ١٠,٦ | ١٠,٨ |
| تێکرایا سالانە | ٢٠ | ١٦,٧ | ١٧,٩ | ٢١,٨ | ٣٢,٤ |

هەر وەسا پێدڤیە ئاماژێ ب هەبوونا دوو وەرزێن ڤەگوهاستی ل هەرێمێ کو بەهار وپایزن بکەن ، ل ڤان هەردوو وەرزا گەرمی یا ناڤنجی یە بۆ ژیانەکا گونجای دەبیت .

### ٣- دابارین:

چەندیا دابارینێ وچۆرێ دابارینێ ل هەرێما كوردستانا عیراقێ لپەی وان هوكارێن كاریگەری لسەر ئاڤ وهەوای هەی تێنە گهورین و ئەو بایێن نزم كو ژ دەریا ناڤەراست دهێن هوكارێن سەرەكیێن دابارینێ نە د هەرێمێدا ، ل هەرێمێ هەمی جۆرێن دابارینێ ( باران ، بەفر ، گژلوك) دبارن .

بەفر بارین ب پلا ئێكێ تایبەتیە ل دەڤەرا چیای ل هەرێمێ ل هەیڤێن زڤستانا دروست ( بەفرانبار و رێ بەندان و رەشەمێ ) دبارێت . ب گشتی گۆپیتكێن چیا و بلنداهی وبنارێن باكوری ژ هەمی دەڤەرێن دی ب بەفرترن . سەبارەت باران بارینێ جوداهیەكا زۆر و چەندیا باران بارین د هەرێمێدا هەیە بۆ نموونە ناڤەندێ بارانا سالانە د هەرێمێدا دناڤبەرا ٣٢٨ملم دایە ل خانەقین و زێدەترە ژ ٧٠٢ملم ل زاخو.

**پرسیار :**

هوكارێ سەرەكیی یێ دابارینێ د هەرێمێدا چیە ؟

ب گشتی بارانیێن هەرێمێ هندی بەرەف باكوور و باكورێ رۆژهەلاتێ بچین پتر دەبن ، ئەڤەژی ژبەر هۆكارێ بلندی و نزمیێ ژلایەكی ڤە و دەربازبوونا هژمارەكا زۆر ژ بایێن نزم چەند بەرەڤ باكوری بچین پتر نزم دبن .

## هەرێمێن ئاڤ و هەواى :-

لسەر بنەمایێ ئەو جوداهیا زورادناڤبەرا دەڤەرێن هەرێما کوردستانا عیراقێدا هەى ژلایێ ئاڤ و هەواى ڤە ب تایبەتی ژلایێ گەرمێ و داباریێ ڤە ، ڤەکۆلینێن نوو یێن تایبەت ب لینکرنا ئاڤ و هەوایی عیراقێ ڤە ڤێ هەرێمێ ژ لایێ ئاڤ وهەواى ڤە بۆ دوو هەرێما پۆلیندکەت:

### ١- هەرێما ئاڤ و هەوایێ دەریاى ناڤەراست :

ئەڤ هەرێمە بەشێن باکورى و باکورێ رۆژهەلاتی ئانکو دەڤەرێن چیا ڤەدگریت ، ژلایێ گەرمێ ڤە ب زڤستانەکا زۆرا سار و هاڤینەکا هین دهێتە نیاسین ، وژلایێ داباریێ ڤە ئەڤ هەرێمە تنێ هەرێمە کو بەفرەکا ستوور تێدا دکەڤی، تێکراێن بارانا سالانە ژ ٥٠٠ ملم کێمتر نینە ، چاندنا زڤستانی د ڤێ هەرێمێداتەمامی پشت ب بارانی گرێدەت ، لەوا ب هەرێمەکا باران مسۆگەر دهێتە نیاسین .

**پرسیار :**

**بۆچی هەرێما ئاڤ و هەوایێ دەریایا ناڤەراست بڤی ناڤی دهێتە نیاسین ؟**

### ٢- هەرێما ئاڤ و هەوایێ نیمچە هشك (گەرمەسێر ):

بەشێ دی یێ هەرێمێ ئانکو دەڤەرا زویرك ڤەدگریت ، د هاڤینێدا پلێن گەرمێ دبەرزن وزڤستانا وێ کێمتر یا سارە ، تیکرایێ بارانا سالانە ژ ٥٠٠ملم کێمترە، وچاندن د ڤێ هەرێمێدا زڤستانیە ، چێدبیت تووشی هشکاتیێ بێت لەورا ب هەرێما بارانا نەمسۆگەر دهێتە نیاسین.

## ڕووەکێ خورستی

ڕووەکێ خورستی (سروشتی ) هەروەکی ژ ناڤی دیارە وان رڕووەکا ڤەدگرێت یێن ئەو بخو شین دەبن . ڕووەکێ خورستی ب گشتی ب کارتێکرنا دناڤبەرا ئاڤ و هەوای ورووییێ ئەردی وئاخێ بەرهەم دهێت . هەر لپەی وێ جوداهیا ئاشکرایا دناڤبەرا ئاڤ و هەوایێ هەرێمێدا هەی ، وجوداهیەکا وەساژی د ڕووەکێ خورستیرا دهێتە دیتن ، ئەڤ جوداهیە ژی دناڤبەرا دارستانێن چیا و گژوگیایێن دەشتێدا ب روونی یا دیارە .

هەرێما کوردستانێ دابەش دبێتە سەر دو کەمەرێن سەرەکی یێن ڕووەکی ئەوژی کەمەرا دارستانا و کەمەرا گژوگیایێن کورت (گەرمەسێر) ان ، هەروەسا ڕووەکێن سروشتییێن دی ژی هەنە کوهەر دەمێ رووبارا پانیەکا بەرفرەهـ بخوەڤە بگریت شیت دبن .

### ئێك / دەڤەرا دارستانا و گژوگیاییێن چیا :-

پرانیا دارستانێن سروشتی دکەڤنە باکورێ رۆژهەلاتا هەرێمێ ، درێژبوونا دارستانێن سروشتی شێوەکێ کڤانەیی بخوڤە گرتیە کو ژ باکوریێ رۆژئاڤا بو سەمتا باشورێ رۆژهەلاتی درێژ دبیت ، ئەڤەژی هەمان سەمت و جهە کو هێلێن بارانێ دێ دەڤەرێدا دچن .



ديمەنەك ژ دارستانا

هەروەسا پترپا ئەو دارستانێن ل بلنداهێن ٦٠٠ –٢٠٠٠ م شین دەبن ئانكو دكەڤنە دەڤەرا ئاڤ و هەوایێ دەریایا ناڤەراست كو زڤستانا سارە و هاڤینا هینە و مام ناوەندیە ، رادا دابارینا سالانە بڤێ دەڤەرێ دناڤبەرا ٥٠٠–١٢٠٠ ملم دایە، جوداهیا رادیێ دابارینێ ل دەڤەرەكێ بۆ دەڤەرەكا دی بۆیە ئەگەرێ جوداهیا چڕ وپریا دارستانا ژ جهەكی بۆ جهەكێ دی .

ئەو رووبەرێ دارستانێن سروشتی نخافتی ب نێزیكێ (٦) میلون دۆنما دهێتە خەملاندن ، وب شیوەكێ نە وەكهەڤ ل دەڤەرێن هەرێمێ بەلاڤ بووینە وەكی خشتێ ژمارە (٢) .

رووبەرێ دارستانێن سروشتی لدویڤ پارێزگەهێن هەرێمێ / دۆنەم .

| پاریزگەھ | رووبەرێ دارستانا ب دۆنەما | ریژا سەدی ژ رووبەرێ گشتی یێ دارستانا |
|---|---|---|
| دهۆك | ٢٠٥٧٦٠٠ | ٪٢٨,٩٤ |
| هەولیر | ٢٣١٢٠٠٠ | ٪ ٣٢,٥٢ |
| سلیمانی | ٢١٩٥٢٠٠ | ٪ ٣٠,٨٥ |
| نەینەوا | ٥١٤٤٠٠ | ٪ ٧,٧٤ |
| دیالا | ١٩٦٠٠ | ٪ ٠,٢٨ |
| سەلاحەدین | ١١٦٠٠ | ٪ ٠,١٧ |
| سەرجەمێ گشتی | ٧١١٠٤٠٠ | ٪ ١٠٠ |

دەرکەڤتی کو پاریزگەها هەولێرێ ل پێشەیا پاریزگەهێن هەرێمێ دهێت ، لدویڤ چری و پریا دارا ، سێ کۆمەلێن سەرەکی یێن دارستانێن سروشتی د هەرێما کوردستانێدا هەنە :

### ١- دارستانێن ڤەکری :

وان دارستانێن بەر بەلاڤ ڤەدگریت کو چریەکا ئاشکرانینە بەلکوی ژ کۆمەکا تراشێن کت کتە لڤێرە و وێراهە پێکهاتینە ، و مەودایەکێ بەرفرەهـ دناڤبەرا وان دایە . رووبەرێ وێ نێزیکی ٤٨ ٪ ێ ژ رووبەرێ سەرجەم دارستانێن سروشتی پێکدئینیت . دشیاندا هەیە جۆرێ دارستانا ل چیایێ شنگالێ و گوێژە و سەفین بهێنە دیتن .

**٢- دارستانا چڕی مام ناوەندی :**

ئەڤ دارستانە ب وێ چەندێ دناڤدارن کو چڕیا وان مام ناوەندیە و ژ ئەگەرا برینا هەرەمەکێ ڤالاهی و دەڤەرا بێ دار تێدا پەیدابوێن ، رووبەرێ وێ نیزیکی ١٦ ٪ یێ رووبەرێ سەرجەم دارستانا نەل دەڤرێن سوارەتووکا و قەرەداغ و ئەتریش وچۆمان دهێتە دیتن .

**٣- دارستانا چڕ :**

چڕیا وێ یا زۆرە دارێن وێ ژ جۆرێن باشن دشیاندا هەیە بۆ بدەست ڤەئینانا کەرستێن داری هەر تەختە ... هتد ب بهێتە بکار ئینان ، رووبەرێ وێ ب رێژا ٣٦ ٪ یێ سەرجەمێ رووبەرێ دارستانا پێك دئینیت .

**پرسیار :**

**دارستانا سروشتی یا هەرێمێ ل سەر چ بنەماد بیتە سێ کۆمەل ؟**

## دوو : دەڤەرا کۆرتەگیا (السهوب) :

پتریا رووەکێن وێ د دەڤەرا زویرکادا هەنە و ب باشترین چروانێ هەرێمێ دهێتە هژمارتن ، ژبەر چەندی وچاوانیا سالوختا و بەلاڤبوونا گژوگیایێ وێ ژی لپەی ژیواری دژێك جودانە ، ل سنورێ ژێریا ڤێ دەڤەرێ گیاو سترێن بیابانێ زێدەتر پێڤە دیارە ، بەلێ ل دەڤەرا چیایێن ژوریدا ، گژوگیا و دارێن وێ نیزیکێ گژوگا و دارێن دەڤەرا چیایی نە . ئەڤ نەوەکهەڤی یی ژی چوان ئاڤ و هەواویێ رویێ ئەردی دەردئێخن کو یی‌چ ب بێ جوداهی تێدا پەیدادبیت. باران ل باشورێ دەڤەرێ کو ٢٠٠ ملم دبیت زێدە دکەت بۆ ٤٠٠ ملم ل سنورێ باکورێ دەڤەرێ . ژناڤدارترین رووەکێن ڤێ دەڤەرێ گژوگیایێ جۆرا وجۆرن وەکی کەنگرو ئەنیمون و قوراد تولك .

## دەرامەتێ ئاڤێ

ل هەرێما کوردستانێ دو شێوێن دەرامەتێ ئاڤێ هەنە : ئاڤا بن ئەرد و ئاڤا سەر ئەرد ، ئەڤ هەردو ژێدەرێن درامەتێ ئاڤێ پشت ب چەندیا بارانێ و بەفرا حەلیای ڤە گرێددەت کوکار دەکەتە سەر سروشتێ ئاڤا سەر ئەرد وبن ئەرد .

لپەی وان بارانێن هەرێمێ ب شێوەکی تایبەت د وەرزێ زڤستانێدا دبارن . بارانێن ڤی وەرزی پشکا هەرە مەزنا ئاڤا رووبارێ دیجلە و ژێدەرێن وێ پێك دئینیت . ل هەرێما کوردستانێ بەفر بارین ل داویا هەیڤا کانوونا دووێ دەست پێدکەت و حەلاندنا وێ ل هەیڤا نیسانێ دەست پێدکەت ئەڤەژی کاردکەتە سەر چەندیا سالانەیا ئاڤا سەر ئەردی و زان و پەقینا ئاڤا بن ئەردی .

### ١- ئاڤا بن ئەردی :

ئاڤا بن ئەردی ب ژێدەرەکێ گرنگێ دەرامەتێ ئاڤێ ل هەرێما گوردستانێ دهێتە هژمارتن ، ژ بەر ب کارئینانا وێ د بیاڤێن جوراو جۆرێن ژیانێدا ، سەرباری وێ چەندێ کۆ هۆکارەکە ژ هۆکارێن سروشتی بۆ پێك ئینانا ئاڤا سەر ئەرد چونکی ب ئێك ژ ژێدەرێن گرنگێن ئاڤا روبار و دەریاچا دهێتە هژمارتن ، ئەف دەرامەتە رولێ خۆ دگێرت ژبۆ تێرکرنا پێدڤێن ئاکنجیا بۆ ب کارئینانا وان و پێدڤێن ئاژەلی و چاندنا هاڤینێ ل هەرێمێ . هەر وەسا هەتا رادەکێ زۆر ژی ل گەلەك جهێن هەرێمێ جهێ خۆجهبوونا مرۆڤا دیار دکەت . درێژبوونا زنجیرێن چیا ب سەمتا باکورێ رۆژئاڤا - باشورێ رۆژهەلاتێ کو دناڤبەرا واندا چەند نهال و دەشت هەنە .

ئەو دەڤەر كرینە عومبارەكا مەزنا ئاڤێ بن ئەرد ، زێدەباری وێ پێكهاتییێ كلسییێ ئاڤ هەلگر وكونكدار هاریكارە ژبو بەرفرەهیا ئاڤا بن ئەرد ل هەرێمێ . ژ ئاڤزیلێن گرنگێن ئاڤا بن ئەرد د هەرێمێ دا ئاڤزیلێن هەولێر ، ئاكرێ ، شارەزوو ، رانیە و، قەلادزێ .

## ئاڤا بن ئەرد ل هەرێمێ دابەش دبیت بۆ :

### ١- بیر و كارێز :

بیرب ئێك ژ ریكێن كەڤنێن دەرئیخستنا ئاڤا بن ئەرد ل هەرێمێ دهێتە دانان، ژپێخەمەت دابینكرنا پێدڤیێن جورا وجۆرێن ئاكنجیا دهێنە كولان . سەبارەت ب كارێزا ژی كارێز ریكەكا گەلەك كەڤنە كو ئاكنجیێن هەرێمێ بۆ دەرئیخستنا ئاڤا بن ئەرد ب كاردئینا ،پێكهاتیە ژ كۆمەكا بیرا كو ب ریكا هندەك جوكاڤە هاتینە گرێدان وئاستێ هەر ئێكێ ژوان ژیا بەری خۆ نزمترە و ماوێ كیمتر ژ ٢٠ میترا دناڤبەرا وان دایە .

### ٢- ژێدەروكانی :

پیڤانا بلندی و نزمیێن سەر روویێ ئەردی و تایبەتمەندیا جیۆلۆجی رولێ خۆ د پترڀا ژێدەروكانیێن هەرێمێدا گێرایە ،كونكداریا كەڤەرێن سەقامكیرب سەر چینێن كەڤرین یێن ئاڤ هەلكر و هەبوونا گەلەك دەرز و كۆنا هەمی هۆكارەكێ هاریكار بوون بۆ بەلاڤبوونا ژێدەرێن وێ ،ئەڤە زێدەباری هەڤ ئاستێ ئاڤا بن ئەرد دگەل رۆییێ ئەردیدا ،ئەڤان ژێدەروكانیا رۆلەكێ چالاك د دابەش بوونا ئاڤەدانییێن هەرێمێدا گێرایە .

د هەرێمێدا چەندین ژێدەروکانیێن ئاڤا کانزایی هەنە کو ژبەر ناڤەرۆکا وێ یا کیمیایی دنوژدارییێدا بۆ چارەسەرکرنێ ب کاردیت .وەکی کانیێن بانیا خێلان، بازیان ،شێخێ باڵەکان وشێرە سوار ، ئاڤا بن ئەرد ب شێوەکێ گشتی د هەرێمێدا ب سەر دو دەڤەرا دا دابەش بوویە .

**ئێک:** دەڤەرا چیایێن بلند کو ب مشەییا ئاڤابن ئەرد و زەلالیێ و کێمیا ناڤەرۆکا کانزایی . حەلیای و کێمیا پیس بوونێ دهێتە جوداکرن .
**دوو :** دەڤەرا نەهند ئاسێ یە کۆ چەندی و زەلالیا ئاڤاوێ ل دەڤەرا ئێکێ کێمترە .

## ٢- ئاڤا سەر ئەرد :

دەرامەتێ ئاڤا سەر ئەرد ل هەرێما کوردستانێ خود رووبار و دەریا چادا دبینتە ڤە ، هەرێما کوردستانێ دڤێ بیاڤیدا یا دەولەمەندە چونکی رووبارێ دیجلە وهەر پێنج تایێن وی د ئەردێ وێدا دەربازدبن .
ئەو تایێن درێژنە رووبارێ دیجلە ئاڤەرۆیا وان دکەڤیتە سنۆرێ هەرێمێ و پارچێن دیێن کوردستانێ ک ٦٦ ٪ ێ داهاتێ سالانە یێ ئاڤێ بۆ رووباری دیجلە دابین دکەن .

### رووبارێ دیجلە :

رووبارێ دیجلە ژ دەهمانێن ژێریا زنجیرا چیایێن رۆژهەلاتا توروس ل باکورێ کوردستانێ دزێن ، پشتی ل باکورێ گوندێ پێشخابور دهێتە ناڤ ئاخا کوردستانێ دناڤ نهاڵەکا بەرفرها خاروڤیجیدا وبۆرت وپشتی هنگێ بانیا مووسل دبریت ود وریێدا بەنداڤ (سکر)ێ مووسلێ لسەر دروستکریە .

پشتی وێ بلنداهیێن حەمرین ل دەرتەنگا فەتحە دبریت  وب سەمتا باشوورێ رۆژهەلاتی درێژدبیتە ڤە، دۆرێژیاوی ژ  پێشخابور هەتا فەتحە ٤١٠ کم دبیت ، پێنج تایێن سەرەکی دڕژنە سەر کو دکەڤتە لایێ رۆژهەلاتێ رووباری ،لپەی ئێك ئەڤەنە : خابوور ، زێێ مەزن  ،  زیێ بچووك ، عوزێم ، سیروان (دیالە) .

**پرسیار :** بۆچی ئاڤا بن ئەرد ل هندەك دەڤەرێن هەرێمێ بۆ چارەسەرکرنا نەخوشیا ب کاردهێت .

### ١- خابوور :

ئێکەم تایە دگەهیتە رووبارێ دیجلە ب ئێك گەهشتنا هەردوو تایێن وی مەهرما و هیزل  دروست دیت ول  باکورێ گوندێ جالیکە دهێتە ناڤ ئەردێن هەرێمێ . پشتی کو رێرەوا خۆ بەرەف باکور و باکورێ رۆژئاڤا دگهوریت و ناڤ زاخۆ ڕا دەربازبیت  .

درێژیا ڤی تای دگەهیتە ١٦٠ کم و تێکرایێ داهاتێ ئاڤا وی یا سالانە دگەهیتە ١,٩٦ ملیار /م٣  ، ب رێژا ٢٢ ٪ ێ  پشکداریێ  د سەرجەمێ سالانە یێ ئاڤا رووبارێ دیجلە دا دکەت .



ديمەنێ رووبارەكی

## ٢- زێێ مەزن

ئەڤ زێیە ب گرنگترین تایێن رووبارێ دیجلە دهێتە هژمارتن ، ل چیایێن هەكاری ل ناڤەراستا دناڤبەرا دەریایا وانێ و دەریا یاورمێ دزێت ، ول نیزیك گوندێ چالْ ل باكورێ قەزا ئامێدییێ د دەڤەرا بارزاندا دبۆرت بەرەڤ باشورێ رۆژهەلات لاددەت و پاشی رووبارێ شین و شەمزینان درێژنە سەر،پشیی تایێ رەواندوزێ درێژیتە سەر ئەڤ رووبارە رێوەوا خۆ ب سەمتا باشەرێ روژئاڤا دگهورتی و ل نیزیك كاڤلێن نەمرود درێژیتە دیجلە ، درێژیا زێێ مەزن ٣٩٢ كم . داهاتێ ئاڤاوی یاسالانە دگەهتە ١٣,٢٩ ملیار / م٣ ئەڤ رووبارە ب رێژا ٣٣ ٪ێ پشكداریێ د سەرجەمێ سالانە یێ ئاڤا رووبارێ دیجلەدا دكەت .

### ٣- زێێ بچووك:

چیایێن قەندیل ولاجان ب ژێدەرێن سەرەکیێن ئەڤی زێێ وتایێن وی دهێنە هژمارتن ، ژ چەند لقێن بچووك پێکهاتیە ل نزیکی گوندێ ماشان دهێتە ناڤ ئاخا هەرێما کوردستانی ، ب شێوەکی سەرەکی ل ئێککگرتنا رووبارکێ تیت ورووبارکێ ماوەت ( قەلاچۆلان) پێك دهێت ، زێێ بچووك دەشتێن پشدەرو قەلادزێ دبریت و ژ بەندەرێ دوکان دبۆریت ، د وێرێدا سکرێ دوکان لسەر هاتیە دروست کرن ، رێرەوا ڤی رووباری بەرەڤ باشورێ رۆژئاڤا درێژد بیت ب (پردێ- ئالتون کوپری) دا د بۆریت هەتا ل دووراتیا ٣٠کم ل باشورێ شەرقات و رێژیتە رووبارێ دیجلە ، درێژیا زێێ بچووك ٤٠٠کم داهاتێ ئاڤاوی یێ سالانە ٦,٩٩ ملیار / م٣ رێژا ١٧ ٪ پشکدارییێ د سەرجەمێ سالانەیێ ئاڤا رووباری دیجلەدا دکەت .

### ٤- رۆخانە ( عوزێم ):

چیایێن قەرەداغ و شوان ب ژێدەرێن سەرەکی بۆ تێرکرنا تایێن ڤی رووباری وەرزی دهێنە دانان .

ئەڤ رووبارە ژ سێ لقێن وەرزی پێك دهێت ئەو ژی (خاسەسو) کو باژێرێ کەرکووکی دکەڤیتە سەر، (تاوغ سو) کو باژێرێ (داقوق ) ل سەرە ، و (ئاق سو) کو باژێرێ (دوز ) ل سەرە ، ول پشتی هنگێ عوزیم ل باشورێ بەلەد دریژیتە رووباری دیجلە .

دریژیا ڤی زێی ٢٣٠ کم تیکرایێ داهاتێ ئاڤاوی یا سالانە دەگهیتە ٠,٧ ملیار/ م٣ بەریژا ٢٪ بشکدارییێ د سەرجەمێ سالانە یێ ئاڤا رووبارێ دیجلەدا دکەت .

### ٥- سیروان ( دیاله ) :

چیایێن رۆژهەلاتێ کوردستانێ و چیایێن پارێزگەها سلێمانی ب ژێدەرێن سەرەکیێن ئاڤا ڤی رووباری دهێنە دانان ، ل نزیکی گوندێ لاوەرانە دهێتە ئاڤ ئاخا هەرێما کوردستانێ وژ ب ئێك گەهشتنا سێ تایێن سەرەکی پێك دهێت ، رووبارێ سیروان و رووبارێ تانجەرۆ رووباری زەلم ، پشتی دناڤ چیایێن هەورەمان و زنجیرا بەراناندا دەربازدبیت ،ل دەرتەنگیا دەربەندیخان سکرێ دەربەندیخان ل سەر رووباری هاتیە دروست کرن . ل نزیکی بلنداهیێن مەنسوریە سکرێ حەمرین لسەر دروست کریە ئەڤ ربارە ل باشورێ بەغدا درێژیتە سەر دیجلەی.
رێژیا وی دگەهیتە ٣٨٤کم،وتێکرایێ داهاتییێ ئاڤاوی یا سالانە ٥,٣ ملیار/م$^3$ ئەڤ رۆوبارە ب رێژا نزیکی ١٤ ٪ ی سەرجەمێ ئاڤا سالانەێ رووباری دیجلە دابین دکەت .

## سکر و بەنداڤ:

د هەرێمێ دا کۆمەکا پرۆژێن دەست بسەر داگرتن و ئاڤ عمبارکرنێ هەنە کو دماوێن جودا جودایێن بۆریدا ل سەر رووباری دیجلە و تایێن رووباری بەرەما ئاڤدانێ وبەرهەمئینانا وزا کەهر وئاڤێ و دوورخستنا مەترسیێن لەهیا و بۆمەرمێن گەشت و گوزاری هاتیە دروست کرن ، د شێین دئەڤێن خوارێدا خرڤە کەین:

### ١- سکر و بەنداڤا مووسل :

ل باکورێ باژێرێ موسڵ ل دەڤەرا ئاسکی موسڵ ل سەر رووباری دیجلە هاتیە دروست کرن ، و ژ سکرێ بەرایە ژ ( ٦) دەرگەها پێکهاتیە ، شانێن ئاڤ هەلگرتنا سـکری دەگەهیتە ١٣,٣ ملیار/ م٣ یێن ئاڤێ ، بۆ مەرما ئاڤدانێ و

بەرهەمئینانا وەزیا کەهرو ئاڤێ و پاراستنا باژێرێ موسڵ و دەڤەرین دورو بەر ژ مەترسیێن لەهیا دهێتە بکارئینان ژبلی بهایێ گەشت وگوزاری ماسی گرتنێ .

**پرسیار :**
بۆچی پرۆژێن (ئاڤدانێ ) ل هەرێمێ دکێمن ؟

## ٢- سکرو بەنداڤێ دوکان :

ل نزیك دەرتی‌نگێ دوکان ل سەر زێێ بچووك هاتیە دانان ، و ژ جۆرێ کۆنکریتی کڤانەیە ، سەرجەمێ ئاڤا هەلگرتی دگەهیتە ٦,٨ ملیار/م٣ . وژ (٥) دەرگەها پێك هاتیە ، وێستگەها بەرهەمهینانا وزا کارەبی بۆ بەرهەمئینانا (١٠٠) هزار کیلو واتا دەمژمێرەکێ کارەب لسەر ڤی سکری هاتیە دانان .
ئاڤا سکری بۆ ئاڤەدانا رووبەر بەرف رە سلێمانی و کەرکووك بکار دهێت، لگەل وێستگەهێ کارەبا دەربەندیخان ژێدەرەکێ سەرەکیێ وزا کارەبێ نە بۆ پارێزگەهێن هەرێمێ . ئەڤە سەرەرای بهایێ گەشت و گوزار ی وبهایێن دیتر .

## ٣- سکر و بەنداڤێ دەربەندیخان :

ئەڤ سکرە ل دەرتەنگا دەربەندیخان ل سەر رووبارێ سیروان هاتیە دروست کرن، ژ سکرێن بەری یە ژ (٣) دەرگەها پێك دهێت ، وێستگەهێ کارەبا وێ شیانێن بەرهەمهینانا ١١٢٥٠٠ کیلو وات / دەمژمێر کارەبێ هەیە . ئەڤ سکرە زێدەتر ژ ٣ ملیار / م٣ ئاڤێ ڤەدگریت .



ويّنىّ سكرى ( بەنداڤ )

زەڤيّن بەرفرەهـ ژ باژيّرىّ ديالا و سليّمانييّ ب ئاڤا سكرى دهيّنە ئاڤدان وئاڤا وى بۆ چەند مەوميّن دى دهيّتە بكار ئينان .

## ٤- سكر و بەنداڤا حەمرين :

ئەڤ سكرە ل ژيّريا سكرىّ دەربەنديخان لسەر رووبارىّ سيروان هاتيە دروست كرن ، وژ سكريّن بەرى يە و(٦) دەرگەهـ هەنە ، نزيكى ٣,٢ مليار/م٣ ئاڤىّ ڤەدگريت .

## ٥- سكر و بەنداڤا ( دبس ):

ئەڤ سكره ل سەر زيێ بچووك ل قەزا دوبز سەر ب پاريێزگەها كەركووك هاتيە دروست كرن ، ئەڤ سكره زيێدەتر ژ (١٠٠) مليون /م٣ ئاڤێ ڤە دگريت ، بۆ ئاڤدانا زەڤيێن چاندنێ وبەرهەمهينانا وزا كەهرو ئاڤی مفا ژێ دهێته وەرگرتن .




نەخشێ دەرامەتێن ئاڤێ ل هەرێما كوردستانێ

## دەرامەتێن کانزایی

وەرارکرنا هەر هەرێمەکا جوگرافی بشت ب ئاستێ مشەییا دەرامەتێن سروشتی ڤە گرێدەت د ناڤ وانژیدا دەرامەتێن کانزا یی کو رۆلەکێ گرنگ و بەرەف پێش ڤەبرنا ژیارا ئابووری یا ئاکنجیێن هەرێمێدا دگێرن.

هۆکارێن سروشتی تنێ هۆکارێ پەربرسە ژ دابەش بوونا جوگرافیا دەرامەتێن کانزایی ، هۆکارێن سروشتی خو د بارودۆخێ جیۆلۆجی وەکی جۆرێ کەڤرا و چەرخێ جیۆلۆجی و لڤینا تیڤکلێ ئەردی و هۆکارێن رامالینێ دا دبینن لسەر بنەمایێ بها و بکارئینانا کانزا د پیشەسازی و پرکرنا پێدڤیێن هەمە جۆرێن مرۆڤی، کانزا د هەرێمێدا دهێنە دابەشکرن بۆ :

### أ- کانزاییێن فلزی :

ئەو کانزانە کو دەدێخیێن و دحەلینن و هندەك فلزێن دی ژێ بدەستڤە دهێن ،ڤان کانزایێن ل خارێ ڤەدگریت .

#### ئێک : ئاسن

ئاسن ل چەند جهەکێن هەرێمێ دەردکەڤیت وەکی ئاسنا وە ل ژێریا رۆژهەتا بێنجوین ، کارگەها سەرچنار کەرستێن خاڤێن ڤێ دەڤەرێ بۆ دروست کرنا چیمەنتویێ ب کار دێنیت .

هەر وەسا خاڤێن ئاسنی ل دەڤەرا بێنجوین ل مێشا و ل باکورێ رۆژهەلاتا بێنجوین دەردکەڤیت ، تێکرایێ رێژا ئاسنی وخاڤێن هەردو جها دگەهیتە ١٨ ٪ .

## دو: قورقوشم وخارسین

نیشتوییێ خاڤێن قورقوشم وخارسینی ل دو دەڤەرێن سەرەکی دەردکەڤیت ، دەڤەرا مەرەبەستە ل نزیکی قەلادزێ ونهالا سەرگوزە ل باکورێ ئامێدیێ . ژ سەرجەمێ خاڤێن هەردو دەڤەرا رێژا قورقوشمی ١٢٪ و رێژا خارسینی ٢٠٪ دەرباز نابیت.

## سێ : سفر و کرۆم

سفرێ خاڤ ل دەڤەرێن نزیکی چوارتا ول کاروتا د ناڤبەرا رایات و گەلاَڵە ، ورانیە و قەلادزێ هەیە.

ئەو خاڤێن کرۆمی کو د سنۆرێ هەرێمێدا ب خاڤێن ئابووری دهێتە دانان ل سنۆرێ زنجیرا چیایێ ماوەت و شلێر ل بێنجوین دهێتن ، ل هندەك جهێن دیتر خاڤێ نە ئابوری تێدا هەیە وەکی شەقلاوە و هێرۆ وئاسناوە .

## چار : مەنگەنیز ونیکل

د هەرێما کوردستانێدا مەنگەنیز ل سیرنا نزیك گوندێ پشت ئاسن هاتیە دیتن هەر وەسا ل بەکراوە و نهالا گەلاَڵە و رایات و ماوەت هەیە. نیکل ل رانیە و بێنجوین و چوارتا ورەواندوز کەفتیە بەرچاڤ .

## پێنج : زێر

چەندەکا کێم ژ زێری ل نهالا شلێر ل باکورێ گوندێ دێزە ، هەر وەسا ل نیزیك میرزا روستم ل نزیك دوکان هەیە .

## ب- كانزاييێن نەفلزی:

كانزايێن نەفلزی دو كۆمێن كانزا ڤەدگرن ب ڤی شێوێ خارێ :

١- ئەو كانزايێن نەفلزی كو بۆ پیشەسازی وئاڤاكرنێ بكاردهێن ژوان :

### ئێک : گۆگرد ( كبريت )

گۆگرد ب شێوێ تۆخمێ پوخت بشێوێ كانزای ژی ل چەند دەڤەرەكا د هەرێمێدا دەركەفتیە وەكی سلێمان بەگ ل باكورێ رۆژئاڤایا كفری و كارگەها دەرئیخستنا گۆگردی ل دوبزوكانێن گۆكردی ل گەرماڤا ل باكورێ دهۆكێ . گۆگرد د گەلەك بیاڤێن پیشەسازیدا وەكی دروستكرنا زبلی و دەزیێن پیشەسازی و كاغەزێ مفای ژێ دهێتە وەرگرتن .

### دوو : جیسوم و ئەنهایدرایت

خاڤێن جیسوم وئەنهایدرایت ل دەڤەرێن مەخمور ، سلێمان بەگ ، كویە دەدركەفیت . ئەڤ خاڤە د پیشەسازیا گێچێ و جیمەنتوێ وب كارئینانێن دی ژیدا مفایی ژێ دهێنە وەرگرتن .

### سێ : بەرێ كلس و دۆلۆمایت

بەرێ كلس و دۆلۆمایت بۆ دروستكرنا كۆنكریتی وشوستە ( رصيف ) یێن رێ و رێبارا مفا ژی دهێتە وەرگرتن هەر وەسا بۆ دروستكرنا گێجێ و چیمەنتویێ. وەكی كەرەستەكێ دەسپێكی دهێنە بكارئینان .

بەرێ كلس و دۆلۆمایت پانیەكا بەرفرەهـ ژ هەرێما كوردستانێ دادپوشن . ژگرنگترین دەڤەرێن وێ بادۆش ل موسلْ ، كانی دوملان ل كەركووكێ ، ئاكرێ، چیایێ قەرەچوغ ، نیشتویێن سەرچنار ل سلێمانیێ .

### جار : قوم و چگل(خیز وحەسو)

خیز و حەسو ژ ئەنجامێ هیربوون وشکەستنا کەڤرو بەرا پەیدابووینە بۆ چەندین مەرەما دهێنە بکارئینان بۆ نموونە دروستکرنا تێکەلێ کۆنکریتی و حەلاندن و دروستکرنا شیشەی . نیشتویا خیزو حەسوی سنۆرەکی بەرفرەهـ د هەرێمێدا ڤەگرتیە ژوان نیشتویێن نهالا داقوق و خاسە ل کەرکوکێ ، خیزو حەسویێ نیشتی ل زێێ مەزن ل دەڤەرا سفییە وئاسکی کەلەك .

### بێنج : بەرێ مەرمەر

ڤەکۆلینا دیار کریە کو مەرمەر ب شێوەکێ بەر فرەهـ د هەرێمێدا بەلاڤە و جۆرەکێ زۆرێ باشە . گرنگترین دەڤەرێن مەرمەر بخوڤەکرتی بێنجوین و چوارتا و قەلادزێ وگەلاله و رایات و رەواندوز و شنگالن .

## ٢- ئەوکانزاییێن نەفلزی یێن وەك سوتەمەنیێ دهێنە بکارئینانا ژوان :

### ئێک : یۆرانیوم

یۆرانیوم ل دەڤەرێن بێنجوین وقەلادزێ وکێوەرەش وگارەی هەیە .

### دۆ: رەژیا بەری

رەژیا بەری د هەرێمێدا ب گشتی چەندەکاا زۆرا خلتە (شوائب) تێدایە ئەڤێ ژی بهایێ وێ یێ ئابووری یێ کێم کریە . ئەڤ کانزایە ل دەڤەرێن کفری ، ئەنجانە و بێنجوین ، هەر وەسا ل زاخۆ ل گوندێ ئیسلام نزیکی شەرانش دهێنە دەرئێخستن .

### سێ : نەفت

کەڤنترین دەڤەرا رۆژهەلاتا ناڤەراست کو نەفت لێ هاییتە دیتن هەرێما کوردستانێ یە . هەر ژ کەڤندا گوریا نەڤەمریایا بابە گورگور یا بەرنیاسەنەفتچیا نەفتا بەربەلاڤ کۆم دکرو وەك ژێدەرەکێ سوتەمەنیێ و رۆناهیێ دفروت .
کۆمێن نەفتا هەرێما کوردستانێ دبەلاڤن بشێوێ پێکهاتنا قۆچەکی ( هرمی) یارۆن وئاشکرایە کو ب نێچیرگەهەکا نموونەییا خرڤەبونا نەفتێ تێتە دانان .

**پرسیار :**

رەژیا بەری د هەرێمێدا بهایێ وێ یێ ئابووری یێ کێمە، بۆ ؟

## کانین نەفتێ ل هەرێمێ دابەش بووینە سەر سێ کۆما .

### ١- کانیێن باشور:

کانیا نەفتخانە ل خانەقین ڤەدگریت ، بەرهەمێ ڤێ کانیێ ل سالا ١٩٢٧ ز دەسپێکریە.

### ٢- کانیێن نەفتا ناڤەراست

مەزنترین کانیێن نەفتێ یێن تێدا د چارچوڤێ هەرێمێ و عیراقی و رۆژهەلاتا ناڤەراستدا . کانیێن ڤێ دەڤەرێ کانییێت بابەگورگور و بای حەسەن و چەمەبۆر ل پارێزگەها کەرکووکێ ب خوڤەدگریت . ل سالا ١٩٣٤ز بەرهەم ئینانا بازرگانی یا کانێا بابەگورگور ل کەرکووکێ دەسپێکر .
کانیا (تەق تەق) ل پارێزگەها هەولێرێ کو لڤێ داویێ دا دەست ب بەرهەمئینانا وێ هاتیەکرن ٢٠٠٩/٦/١ بۆ ژ دەرڤە هاتیە هنارتن .

## ٣- کانییێن باکور :

کانیێن عەین زالە و بەتمە ڤەدگریت . کانیێن تاوکێ ل زاخۆ ژ ٢٠٠٩/٦/١ کەفتە بیاڤێ هنارتنێ .




نەخشێ نەفت و سامانییێن کانزای د هەرێما کوردستانێدا

## ئاكنجیێن هەرێما كوردستانێ

**پێشەكی :** ئەو باس وڤەكۆلینێن پەیوەندی ب ئاكنجیا ڤە هەی ، ژلای وەراركرنا وان ، دابەشكرنا وان ، چریا وان ، پێكهاتنا وان ... هتد هەمی دبناغەدا پشت گرێداي ئامارێ نە ژبەر هندێ د باسێ د ئاكنجیێن هەرێمێدا ، پێدڤیە باسێ وان ئامار و سەرژمێریان بكەین كو د عیراقێدا نهو هاتینە ئەنجامدان وەكی سەرژمێرێن سالێن ( ١٩٤٧ ، ١٩٥٧، ١٩٧٧ و ١٩٨٧) كو باشترین سەرژمێری یا سالا (١٩٥٧) بوویە ، بەلێ سەرژمێرین دویڤدا بۆ مەبەستێن رامیاری و نەتەوەیی گورین وئامارا دا هاتنەكرن ، ژمارە ورێ ژا نەتەوێن وەكی كورد و توركمان و كلد وئاشوری سەختەكاری تێدا هاتنە كرن .

### زێدەبون وەرارا ئاكنجیێن هەرێمێ :

مەرەم ژ زێدەبوونا ئاكنجیا ئەو گهورینا سروشتیە كو ژ ئەنجامێ جوداهیا دناڤبەرا ژمارا ژ دایك بویا و ژمارا مریا پەیدا دبیت ، ئەگەر ل سەرژمێریێن ئاكنجیێن عیراقێ بنێرین دێ بۆمە دەركەڤیت كو دماوێ دناڤبەرا سالێن ( ١٩٥٧ – ١٩٦٥) دا كو رێژا زێدەبوونا ئاكنجیا ل هەرێما كوردستانێ ٢,٤ ٪ بوویە ، ئەڤەژی ڤەدگرێت بۆ وان كێم وكورتیا كو دكارێ سەرژمێریێدا هەبووینە ، و بو بارێ نەئارامێ هەرێمێ كو سەرمژمێری دهندەك دەڤەرادا نەهاتیە كرن و ئامارا وان ب خەملاندن هاتیە نڤیسین . دماوێ دناڤبەرا (١٩٦٥ –١٩٧٧) رێژا

زێدەبوونێ بلند بوویە بوو ٣,٨ ٪ ژبەر کو وێ سەرژمێرییێ هەمی دەڤەرێن هەرێما کوردستانێ ڤەگرتبون دگەل هەمی وان ئاوارە و دەربەدەرێن کو ڤەگەرابوون بو ناڤ هەرێمێ ل ناڤەراستا سالێن حەفتیا ل سەدێ بوری . دماوێ دناڤبەرا (١٩٧٧ – ١٩٨٧ ) ئەو رێژە نزم بوو ، بۆ ٣,١ ٪ ئەڤەژی ڤەدگەرێت بو وان کارێن خرابێن رژێمێ دژی گەلێ کورد . ب گشتی ولگورەی سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ ژمارا ئاکنجیێن هەرێمێ گەهشتە (١،٧٢٢,٥٦٤) کەسا ول سالا ١٩٨٧ بلند بوو ، بو ( ٤,٠٩٦,١١٥.) کەسا ، دهێتە خەملاندن کۆد سالا (٢٠٠٥) ز دا ژمارا ئاکنجیێن هەرێما کوردستانا عیراقێ ژ (٧) حەفت مەلیون کەسا زێدەتر لێ هاتبیت ، بنێرە خشتی ژمارە (٣) .

بلند بوون و نزمبوونا رێژا زێدبوونا ئاکنجیێن هەرێما کوردستانێ ژ ئامار و سەرژمێرییێن سالێن ١٩٤٧ ، ١٩٥٧ ، ١٩٧٧ ، ١٩٨٧ وی بارودۆخێ نە ئاسایی نیشاددەت کویێ کوردستانا و عیراقێ تێدا ژیانێ کو هەردەم بزاڤ هاتیە کرن ئامار و راستیاڤەشێرن و سەختەکارییێ تێتا بکەن بو حوکمێ رەگەزپەرستیا بەعسا عەرەبی یا وی دەمی . گومان د وێ چەندێ دا نینە کو سەرژمێرییێن نوو وان ئامارا بتمامی بشت راستکەن ، ژبەر کو جڤاکێ کوردەواری ب زۆریا ئەندامێن خێزانێ و زۆریا ژمارا ژ دایك بوویا دهێتە نیاسین . لەورا زۆر ئاساییە رێژا زێدەبوونا سالانە هەتا نهو دناڤبەرا ٣–٤ ٪ دابیت ( بۆ هەر ١٠٠ کەسا ٣–٤ کەس سالانە زێدەبن ) .

**پرسیار :** بۆچی بەرێ حکومەتا مەرکزیا بەغدا بزاڤ دکر سەختەکاریا د ئامارێن کوردستانێ دا بکەت .

خشتێ ژمارە (٣)

ژمارە و ریژا ئاکنجیێن کوردستانێ ل چاڤ ئاکنجیێن عێراقێ ١٩٤٧ز – ١٩٨٧ز.

| سالٚ | ژمارا ئاکنجیا | رێژە ژ سەرجەمێ ئاکنجێن عیراقێ |
|---|---|---|
| ١٩٤٧ | ١٣٤٧٣٧١ | ٪٢٨ |
| ١٩٥٧ | ١٧٢٢٥٦٤ | ٪ ٢٧,٤ |
| ١٩٦٥ | ٢١١٨٢٨٨ | ٪٢٦,٣ |
| ١٩٧٧ | ٣٠٦٩٤١١ | ٪٢٥,٩ |
| ١٩٨٧ | ٤٠٩٦١١٥ | ٪٢٥,١ |

## دابەشبوونا ئاكنجیێن هەرێما كوردستانێ :

ئەگەر چاڤ خشاندنەكێ ب نەخشێ دابەشبوونا ئاكنجیا د كیشوەر و ولاتێن جیهانێدا بكەین وێ نیشاندەت كو ئەو دابەشبوونە ب شێوەكێ وەكهەڤ و رێك وپێك نینە ، بەلكو نەرێكی و نەوەكهەڤیەك دڤی چەندێدا هەیە، هەر ژ كەڤن وەرە مرۆڤ دوان دەڤەرا دا خو جهبوویە ، كو دەرامەتێن سروشتی بساناهی و ب مشەیی دەست دكەفت ، هەرێما كوردستانێ ژی هەر ل دەسپێكا چەرخێن بەرینی مرۆڤ تێدا خو جهە بوویە وكارێ چاندنێ كریە و گوندو بارێژك دروست كرینە ، ژبەر كو بارێ ئاڤ و هەوای وجورێ ئاخێ و ژێدەرێن ئاڤێ هاریكار بوون خوجهبوونێ ل كوردستانێ ، ئەڤەژی ب ئاشكرا بەرچاڤ دكەڤیت كو ب شێوەكێ بەربەلاڤ ب سەر هەمی دەڤەرێن هەرێمێدا دابەش بووینە ، ئانكو مەلبەندێن خو جهبوونێ ( گوندو باژێرك ) ب ژمارە زورن بەلێ پتریا وان قەبارە بچووكن و بشێوەكێ بەربەلاڤ و پشت گرێدان ژێدەرێن ئاڤا بن ئەرد بسەر هەرێمێ دا بەلاڤ بووینە ، ئەڤ دیاردە بەرۆڤا ژیە دگەل مەلبەندێن خو جهبوونێ ل ناڤەراست وژێریا عیراقێ ، كو ئەو ب شێوەكێ بەر بەلاڤ، و ژێك دا برِی لسەر رووبەرێ دەڤەرا ناڤبریدا .

یا هەژی گۆتنێ یە كو سەرژمێریا دناڤبەرا سالێن ١٩٨٠ – ١٩٩٠ گورِینەكا مەزن بسەر دابەشبوونا ئاكنجیێن هەرێمێدا هات ، ئەوژی ژ ئەگەری ڤەگوهاستنا ئاكنجیێن هەرێمێ ژ گوند و باژێركا بۆ كۆمەلگەهێن بخورتی ب بەهانێن نە د جهێ خودا وەكی نەهێلانا شورەشا چەكداریا گەلێ كورد ، شەرِێ عیراق – ئیران و دوویرئێخستنا كوردا

دەڤەرێن چاڵێن نەفتێ ، بنێرە خشتی ژمارە (٤) . هەر ژ ئەگەرێ ڤێ سیاسەتێ ،رێژا خوجهێن گوندا گەلەك کێم بوویە ، و خوجهێن بارێژا زێدەبوویە .

**پرسیار :**
بۆچی دابەشبوونا ئاکنجیا بسەر دەڤەرێن وەلاتی وەکهەڤ نینە ؟

خشتێ ژمارە (٤)

| پارێزگەهـ | سەرژمێریا ١٩٥٧ | | سەرژمێریا ١٩٨٧ | |
|---|---|---|---|---|
| | گوند | باژێر | گوند | باژێر |
| دهۆك | ٨٢,٨ | ٧,٢ | ٢٥,٥٤ | ٧٤,٦ |
| هەولیر | ٧٣,٢ | ٢٦,٨ | ٢٢,٧ | ٧٧,٣ |
| کەرکووك | ٦١ | ٣٩ | ٢٦ | ٧٤ |
| سلێمانی | ٧٤ | ٢٦ | ٢٩ | ٧١ |
| نەینەوا | ٧٢,٤ | ٢٧,٦ | ٥٨ | ٤٢ |
| خانەقین | ٦٨ | ٣٢ | ٤٧ | ٥٣ |
| کوردستان | ٧١ | ٢٩ | ٣٣ | ٦٧ |
| عێراق | ٦١ | ٣٩ | ٣٣ | ٧٠ |

## پێکهاتا ئاکنجیێن هەرێما کوردستانێ

ڤەکۆلینا ئاکنجیا ل گورەی تەمەن و نێرو مێ بهایەکێ مەزن هەیە ،ژبەرکو سەروسیمایێ دیمۆگرافیێ وی چڤاکی رۆندکەت ، دەردئێخیت ژمارە و رێژا وی چڤاکی چەندە ؟ ئەوێن شیانا کارو بەرهەمئینانێ هەی چەند نیشاد دە ؟ هەر وەسا وەرار و زیدەبوونا ئاکنجیا رۆندکەت .

### ١- پێکهاتا نفشێ یائاکنجیا ( ل گورەی نێرو مێ یا ) :

مەرەم ژ ( پێکهاتا نفشی ) رێژا نێری یە بۆ مێ ، ئانکو بەرامبەر هەر (١٠٠) کەسێن مێ چەند کەسێن نێر هەنە ، و دبێژنێ ( رێژا نفشی ) ، ژوان سەرژمێریێن کو هەتا نهو ل عیراقێ هاتیە ئەنجامدان ، ئەڤ رێژەیە هاتیە گۆهورین جوداهی پێڤەدیارە ، بەرێ خو بدە خشتی ژمارە (٥) .

رێژا نفشی ( کور بۆ کچ ) د هەرێما کوردستانێدا د ناڤبەرا سالێن ١٩٥٧ - ١٩٨٧ .

خشتی ژمارە (٥)

| سال | مێ | نیر |
| --- | --- | --- |
| ١٩٥٧ | ١٠٠ | ١٠٤ |
| ١٩٦٥ | ١٠٠ | ١٠٧ |
| ١٩٧٧ | ١٠٠ | ١١٣ |
| ١٩٨٧ | ١٠٠ | ١٠٣ |

## ٢- پێکهاتا ئاکنجیا ل گورەی تەمەنی :

مەرەم ژڤی جۆرێ پێکهاتێ دابەشکرنا ئاکنجیانە لسەر چەند کۆمەلێن تەمەنێ، ئەڤەژی بۆ شلۆڤەکرنا شیانێن کاری و دابەشکرنا ئاکنجیا لسەر کەنالێن جۆرا و جۆر وەکی پەروەردە وفێرکرن ، سەربازی ، پیروپەککەفتی ،زارۆك ، پاشی دیارکرنا وی جڤاکی ب گشتی کا زاروکە یان گەنجە یان پیرە .

دشیێن ئاکنجیێن هەرێمێ لسەر سێ کۆمەلێن تەمەنی دابەش بکەین :

**أ- کۆمەلا تەمەن بچووک :** ئەڤەژی وان کەسا ڤەدگریت کو تەمەنێ وان ژ (٢٠) سالاٚ کێمترە ، ل گورەی سەرژمێریا ١٩٨٧ ریژا گەهشتە ڤێ کۆمەلێ ٥٩٪ ی ژ ئاکنجیان . ئەگەرێ ڤێ بلندیێ ژی ڤەدگەریت بۆ باشبوونا بارێ ساخلەمیێ وئابووری و نزمبوونا ریژا مرنێ دناڤ زارۆکاندا .

**ب – کۆمەلا تەمەن مەزن (دان عەمر) :** ئەڤەژی وان کەسا ڤەدگریت کو تەمەنێ وان زیدەترە ژ ٦٥سالا ، ل گورەێ سەرژمێریا سالا ١٩٨٧ ریژا وان ٥٪ ژ ئاکنجیێن هەرێمێ بوو ، ئەڤەژی وێ دگەهینیت کو ریژا دان عەمر یا کێمە .

**ج- کۆمەلا تەمەن ناڤنجی:** وان کەسا ڤەدگریت کو تومەنێ وان دناڤبەرا (٢٠– ٦٤) سالایە ئەڤەژی ل گورەی سەرژمێریا سالا ١٩٨٧ گەهشتبوو ٣٦٪ . بلندیا ریژا ڤێ کۆمەلێ گرنگیەکا زۆر هەیە ، چونکی کار وبەرهەمئینان وهێزا سەربازی وبەرگری کرن ژ ئاخێ پتر د ستوویێ ڤێ کۆمەلێ دایە . بنێرە خشتێ ژمارە(٦) .

### خشتێ ژمارە (٦)

### رێژا دابەشبوونا ئاكجنیا ل هەرێما كوردستانێ ل گورەی تەمەنی :

| ماوێ تەمەنی | رێژە ل گورەی تەمەنی | رێژە ل گورەی سەرژمێر یا ١٩٨٧ |
|---|---|---|
| ٠-١٩ | ٪ ٥٣,٦ | ٪٥٩ |
| ٢٠-٦٤ | ٪٤١,٦ | ٪٣٦ |
| ژ ٦٥ سالا زێدەتر | ٪٤,٨ | ٪٥ |

**٣- پێكهاتا ئاكنجیا ل گورەی ئاینی :**

جهێ جوگرافیێ كوردستانێ و مێژوویا دێرینا خوجهبوونا ئاكنجیان تێدا بوویە ئەگەرێ وێ چەندێ كو ژمارەكا ئایین و بیرو باوەرێن ئایینی د هەرێمێدا بەلاڤبیت، بەلێ یێن سەرەكی ئەڤەنە :

**أ- ئیسلام :** رێژا ٩٤٪ ێ ژئاكنجیێن كوردستانێ موسلمانن ، ئەڤەژی ل گورەی سەرژمێریا سالا ١٩٨٧ ، ولسەر هەموو پارێزگەهێن هەرێمێ دابەش بووینە .

**ب- دیان ( مەسیحی ) :** رێژا وان ٣ ٪ ێ ژ ئاكنجیێن هەرێما كوردستانێ یە ، ل گورەی سەرژمێریا سالا ١٩٨٧ پتر ژ ٣٧٪ ێ مەسیحیێن عیراقێ ئاكنجیێن هەرێما كوردستانێ نە و پتریا وان د دەڤەرێن دهۆك و تلكێف و بەعشیقە و بەرتەلە و هەولێر و كەركووكێ داخو جهن .

**ج- ئێزدی :** رێژا ٣٪ ێ ئاكنجیێن هەرێما كوردستانێ پێكدئینن ، د دەڤەرێن شێخان وشنگال و بەعشیقە وموسل دا خو جهن .

**د- ئاینێن دی :** وەكی جوهی ، سابئە ، ئەڤە ریژەكا كێم ژ ئاكنجیێن هەرێمێ پێكدئینن د ناڤ باژێرادا دبەلاڤ و خوجهن

دابەشبوونا ئاكنجیێن هەرێما كوردستانێ ل گورەی ئایینی:

| پارێزگەهـ | موسلمان | دیان ( مەسیحی ) | ئیزدی |
|---|---|---|---|
| دهۆك | ٨٩,٤ | ٦,٦ | ٣,٩ |
| هەولیر | ٩٧,٩ | ٢ | ٠,٠٤ |
| كەركوك | ٩٦,٧ | ٢,٤ | ٠,١ |
| سلێمانی | ٩٩,٧ | ٠,٢ | ٠,١ |
| نەینەوا | ٨٦,٧ | ٤,٩ | ٨,٢ |
| كوردستان | ٩٣,٧ | ٣,١ | ٣,٣ |
| عێراق | ٩٦,٧ | ٢,١ | ٠,٩ |

## ٤- پێكهاتا نەتەوەیی:

ئەڤەژی پێكهاتا ئاكنجیان ل گورەی نەتەوەی ڤە دگریت ، جهێ جوگرافیێ هەرێما كوردستانێ رولەكێ مەزن هەبویە دا گو ئەڤ دەڤەرە ببیتە پرەكا ئەردی بۆ دەربازبوونا گەلەك نەتەوا و د ئەنجامدا هندەك ژوان مان و خوجهبوون ، پاشی كاركرە سەر پێكهاتا نەتەوەیا ڤێ دەڤەرێ ، ئامار و زانیارییێن تایبەت ب پێكهاتا نەتەوەیی یا هەرێمێ گەلەك كێماسی وئالۆزی تێدا هەنە ، ژلایەكی ڤە ئامار ل گورەی پارێزگەها هاتینە پۆلێنكرن ، وژ لایەكی دی ڤە كارێ ڤەگۆهاستن و ب عەرەب كرنێ

رۆلەکێ خراب هەبوویە لسەر سەروبن کرنا  راستیا ، لەورا ژ ڤی لایی ڤە دڤێت ب هشیارانە زانستیانە سەرەدەریێ لگەل ئامارا بکەین ب گشتی نەتەوێن سەرەکی یێن هەرێمێ ئەڤەنە:

**١- کورد :** کەڤنترین نەتەوێ خو جهێ کوردستانێ یە د هەموو دەڤەرێن وێ دا  بەلاڤ بووینە ، ل گورەی سەرهژمیریا سالا ١٩٥٧ ل ٥٦٪ یێ ژ ئاکنجیێن کوردستانێ پێکدئینن هەر چەندە کو ئێزدی و شەبەك  کوردن وب کێماتیێن ئایینی هاتینە دانان ، بەلێ د سەرژمێرییێن داوێن دا ئەڤ رێژە نزم بویە بو ٥٣,٣ ٪ ی ل سەرژمێریا سالا ١٩٧٧ز ، وئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی ڤەدگریت بۆ :

أ- پەیرەوکرنا سیاسەتا ڤەگۆهاستنێ وب عەرەبکرنێ ، وخوجهکرنا عەرەبا ل جهێ وان ، ب تایبەتی ل پارێزگەهێن کەرکووك و دیالا و موسل .

ب- ژبەر بارێ نەئارامێ هەرێمێ هژمارەکا بەرچاڤ ژ کوردا دناڤبەرا سالێن ١٩٦١ -١٩٩١ دا وپشتی هنگێ بەرەڤ دەرڤە مشەخت بوون .

ج- هەولدان بۆب عەرەب نڤیسینا کوردێن ئەو دەڤەرێن کو ژلایێ حکومەتا عیراقێ ڤە ب جهەکێ ستراتیژی ونەفتێ دهێتە هژمارتن وەکی کەرکووك و خانەقین و دەوروبەرێن موسلێ .

**٢- عەرەب :** چ بەلگەهێن وەسا بەردەست نینن کو ئەوێ دەربێخن کو عەرەب د هەرێمێدا خو جهبو و بەلاڤبووینە ،ئەڤە ڤەدگەریت بو دەسپێکا دامەزراندنا حکومەتا عیراقێ دەمێ هوزێن کوچەرێن عەرەبی پالداین کو د هەرێمێدا خو جهـ بن ، ل دەسپێکا سالێن چلا ژ چەرخێ بیستێ پرۆژێ خو جهبوونێ سیمایەکێ رێك و پێك بخوڤەگرتیە

ویشتی سالا ١٩٦٠ زێدەتر لێ هاتیە ، پاشن حکومەتێن ئێك لدویڤ ئێكێن عیراقێ عەرەب پالدان کو ل کوردستانێ خوجە بن و هەموو هاریکارین دارایی بۆ کرن ، ل سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ دا رێژا عەرەبا گەهشتە ٣٢ ٪ ێ ژ ئاکنجیێن هەرێمێ ، پاشی ل سەرژمێریا سالا ١٩٨٧ بلند بوو وبو ٤٢ ٪ ژبەر بکار ئینانا سیاسەتا ڤەگوهاستن وب عەرەبکرنێ .

**٣- تورکمان :** نڤشێ وان ڤەدگەریت بۆ هۆزێن تورکێن ناڤەراستا ئاسیا پاشی گەهشتنە هەرێمێ ول دەڤەرێ خو جهبوون، ل سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ تورکمان ب پلا سیێ هاتن ، رێژا وان گەهشتبوو ٧٪ ێ ژ ئاکنجیێن هەرێمێ ول سەرژمێریێن لدویڤدا نزم بوو ، بۆ ٣٪ ژئاکنجیێن هەرێمێ ، چونکی تورکمان ژی کەفتنە بەر پێلا ڤەگۆهاستن و مشەختبوونێ بۆ ژ دەرڤە .

**٤- کلدو - ئاشوری :** سەرژمێریەکا هویر و راست ل بەر دەست نینە ، کو پێکهاتا راستەقینە یا کلد وئاشوریێن کوردستانێ نیشان بدەت ، ئەڤ کۆمەلە ، کلدانی وسریانی وئاشوریا ڤەدگریت ، ل سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ رێژا وان گەهشتە ٣٪ی ژ ئاکنجیێن هەرێمێە.

وەکی ئامارێن سەری دا دەردکەڤیت کو رێژا کورد و تورکمان و کلدو وئاشوریا ب شیوەکێ دیار و بەرچاڤ ل سەرژمێریەکێ بۆ سەرژمێریەکا دی کێم بووینە. ئەڤەژی رامانا وێ ناگەهینیت کو ئەڤ پێکهاتێن نەتەوەیی هژمارا وان بەر ب کێمبوونێ یە بەلکی بتنێ رێژا وان ب کێمبوونێ یە ژبەر سیاسەتا ئینانا هژمارەکێن زۆرا عەرەبا ژدەڤەرێن عەرەبستانا عیراقێ بو ناڤ کوردستانێ . لسەر دەستێ حکومەتا نڤش

رەگەز پەرستا بەعس کو کار کریە سەر نزمبوونا وان پێکهاتێن نەتەوەیی دقازانجێ نەتەوێ بالاێ دەست دا دەست بالا بوویە کو نەتەوەیێ عەرەبە .

**دابەشبوونا ئاکنجیێن کوردستانێ ل گورەی پێکهاتا نەتەوەیی د سەرژمێریا سالا ١٩٥٧- ١٩٧٧ دا .**

| | کورد | | عەرەب | | تورکمان | | کلدو ئاشوری | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پارێزگەهـ | ١٩٥٧ | ١٩٧٧ | ١٩٥٧ | ١٩٧٧ | ١٩٥٧ | ١٩٧٧ | ١٩٥٧ | ١٩٧٧ |
| دهۆك | ٣٠,٧ | ٢٥ | ٥٦,١ | ٧٢,٩ | ٤,٨ | ٠,٨ | ٦,١ | ١ |
| نەینەوا | | | | | | | | |
| هەولیر | ٨٩ | ٨٦ | ٦,٦ | ١٠,٤ | ٢,٥ | ١,٦ | ١,٧ | ١,٧ |
| کەرکووك | ٤٨,٣ | ٣٧,٦ | ٢٨,٢ | ٤٤,٤ | ٢١,٤ | ١٦,٣ | ٠,٤ | ٠,٩ |
| سلێمانی | ٩٨,٤ | ٩٣,٩ | ١,١ | ٥,٥٤ | – | ٠,١ | – | ٠,١ |
| کوردستان | ٥٥,٩ | ٥٣,٢ | ٣٢,٢ | ٤٢,٢ | ٧,٣ | ٣,٣ | ٣,١ | ٠,٩ |

مەرم ژ کوردستانێ رووبەرێ سەرجەم پارێزگەهێن دهۆك و هەولێر و کەرکووك وسلێمانی و دەڤەرێن دی یێن کوردستانێ ل پارێزگەهێن نەینەوا و سەلاحەدین ودیالا .

## رەوشا پیشەسازیێ ل هەرێما کوردستانی دا

بەرێ پیشەسازی ل هەرێما کوردستانێ پێك دهات ژ دروست کرنا پێلاڤ و جل وبەرگ و مەحفیرا و ئەو ئامیرێن کو چاندنێدا بکاردهاتن وژ کەل وپەلێن ناڤ مالێ وتشتێن دی ، هەتا ئەڤرۆ ژی ئەو پیشەسازی ب شێوەیەکێ کێم بەردەوامن، هندەك ژوان وەکی جل وبەرگ و پێلاڤ و مەحفیر و وهندەك دشتێن، دی ل بیرەوەریێن کوردی بکارهن و هندەکێن دی بوونە ئەنتیکە ل ناڤ مالێ .

د سەردەمێ د دویڤدا ل سالێن پێنجیا ل سەدێ بیستێ ئەو پیشەسازیێن بەرێ گهورینەکا کێم بەسەرداهات ، گرنگترین گوهورین ئەو بوون کو پیشەسازیا ل ناڤ مال د هاتە بەرهەم ئینان بوو پیشەسازیا کو ل دوکانا بهێتە بەرهەم ئینان و بازارێن جودا جودا یێن باژێرێن کوردستانی، د وی سەردەمیدا بتنێ ئێك پیشەسازی یا مەزن ل کوردستانی دامەزرا ئەوژی پارزێنگەها نەفتێ (ئەلوەند) بو کو ل نزیکی باژێری خانەقین د سالا ۱۹۲۷ دا هاتە دامەزراندن .

بەلێ پشتی سالا (۱۹۵۰) گهورینەکا بنەرەتی بەسەر پیشەسازی داهات ب ئەگەرێ دامەزراندنا ( ئەنجومەنێ ئاڤەدان کرنێ ) د ڤێ سالێ دا بەرنامەکێ پێدڤی وارشت ب مەرما پێشخستنا کەرتێ پیشەسازی د عیراقێ دا ، بەلێ دیسان بەهرا کوردستانێ ژ چالاکیا ڤێ ئەنجومەنێ دامەزراندنا کارگەها چیمەنتویێ سلێمانیێ و یێستگەها بەرهەم ئینانا کەهرەبا دوبز بوو .

د سالێن حەفتێیا و هەشتێیا ژمارا کارگەهـ و دامەزراوێن پیشەسازی گەلك زیدەبوو کو ل هەرێما کوردستانی ، د ئامارا سالا( ١٩٧٠ ) دا ژمارا وان گەهشتە (٣٢٦٢) دامەزراوا ود سالا (١٩٨٨) دا ژمارا وان گەهشتە (٨١٦٦) دامەزراوا.

## پێدڤیێن پێشکەفتنا پیشەسازی :

بێ گومان پشەسازی داکو پێشکەڤیت و جێگیربیت و مفا بۆ ئابووریا وەلاتی هەبیت و پێدڤی ب هندەك بنەما هەیە ژوان کەرستێن خاڤ ، هەرێما کوردستانێ یا دەولەمەندە ب هندەك وان کەرستییێن خاڤ کۆ د پێتڤی نە د پیشەسازی دا وەك نەفتێ وکانێن نەفتێ ل کوردستانی نزیکی رێژا ٥٠٪ نەفتا عیراقێ بەرهەم دئینن ، نەفت ژی ل دەڤەرێن خانەقین و حەمرین و کەرکوك وکۆیە و ناحیا سەلاحەدین وبەتمە وعین زالەدا هەیە. هەر چەندە نەفت ژێدەرەکێ وزێ یە ، د هەمان دەمدا کەرەستەکێ خاڤێ گەلەك گرنگە بۆ گەلەك جۆرێن پیشەسازی یێن بەرنیاس ب پیشەسازيێ پترۆکیمیاوی . هەر وەسا ئاسن ژی ئێکە ژ کەرەستێن خاڤت یێن هەرێما کوردستانێ کو ل ناحیا ئاسناوە ورانیە و رەواندوز و شێخان هەیە . هەر وەسا سفر ل دەڤەرا چوارتا و پێنجوین و قەلادزی هەیە ، ژبلی ڤان جیبس و بەرێ کلسی و گوگرد و مەرمەر و زێر و زیڤ و قورقوشم و نیکل و ئەسبێستۆن ، هەر وەسا کەرستێن خاڤێن چاندنێ کو بۆ پیشەسازی بکار بهێت د ڤێ هەرێمێدا هەنە وەك پەمبی وتویتن و هەر وەسا ئاژەل کو بەرو بوومێ وێ بۆ پیشەسازا خارنێ بکار دهێت نزیکی (٢,٥) مەلیون سەر ئاژەل دە هەرێمێدا هەنە ژ جۆرێ چێل و بەز و بزن و گامیشان .

ژپێدڤێن دی یێن پیشەسازیێ  ووزەیە ئەوژی د کوردستانێ دا ژێدەرێ نەفتە ب شێوەکێ سەرەکی دگەل ئەو کەهرەبا ل بەر سکر و بەنداڤێن دوکان و دەربەندیخان دهێتە دروست کرن . دیسان دەستێ کاری ژی وەکی ئێك ژ هۆکارێن  دی یێن سەرئیخستنا پیشەسازیێ د هەرێمێ دا و ژمارەکا گەلەك ژ خەلکی کو دشیاندا هەیە مفای ژێ بهێتە  وەرگرتن بۆ کارکردنێ ل کارگەها بە تایبەتی ئەگەر مەزانی کو ژمارا ئاکنجیێن هەرێمێ زێدەترە ژ (٥) ملیون کەسا ، جهێ داخێ یە کو مفای ژ ڤی هۆکاری نەهاتیە وەرگرتن .

بازارێن کوردستانێ بازارێن مەزن و گرنگن وژلایێ کەسێ یا فەشارتی چ بزاڤەکا کرین وفرۆشتنێ ل ڤان بازارا هەیە ب تایبەتی پشتی زێدەبوونا  مووچێ فەرمانبەران و کرێیا کرێکاران  پشتی سالا (٢٠٠٣)  پشتی ژناڤ برنا رژێما بەعسی هەروەسا ڤێ رەوشا نوی وەکریە کو ژێدەرێ دارایی ژی زیدەتر بهێاە دابین کرن بۆ خزمەتا پیشەسازیێ چونکە ئەوژی ئێکە ژ هۆکارێن پێشکەفتنا پیشەسازی .

ژپیخەمەت پێشخستنا پیشەسازی دڤێت تۆرەکا پاش وبەرفرەها رێ وریبارا هەبیت مەرەما ساناهی کرنا پەیوەندیا دناڤبەرا باژێرو باژێرکێن کوردستانێ دگەل ژێدەرێن کەرستەیێن خاڤ و دگەل جهێ دامەزراوێن  پیشەسازیا ، یا دیارەژی کو ژ لایێ حکومەتا هەرێمێ ڤە بزاڤەکا زۆر ژبۆ ڤێ مەرمێ هەیە.

لەورا ئەڤرو دهێتە دیتن کو ل سەرانسەری کوردستانێ بەتایبەتی لە دەڤەرێن ئازادکری پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ  ژلایێ لایەنین بەرپرسیارڤە کو بودجەکا زۆر بۆتەرخان کریە بۆ نموونە پرۆژێ جوت سایدێ هەولێر – مەسیف سەلاحەدین و جوت سایدێ کۆیە – هەیبەت سولتان . بەلێ دیارە پرۆژێن هاتینە ئەندامدان لگەل هیڤی و داخازا ناچن ،  دگەل ئێك

چونكی رەوشا رێیا زۆرا خرابە و ب راستی گەلەك ژ ڤان رێیا ژكاركەفتینە ژبەر زۆریا وان ئاستەنگێن كەتینە تێدا ، رێ ل هەرێما كوردستانێ پتر ژجۆرێ هشكاتی نە ونەهێلا ئاسنی هەیە ونەرێیا ئاڤی بتنێ ل ڤان داویا رێیا ئاسمانی هاتیە ڤەكرن، بۆ هندێ پیشەسازیەكا پیش كەفتی دامەزراندن فەرە گرنگی ب ڤان جۆرا بهێتە دان ، جونكی ئەڤرو د جیهانێدا رێ وریبار ب شارەمارا ئابووری دهێتە دانان، سەرمایە ژی هۆكارەكێ دیترە ژ هۆكارێن دامەزراندنا پیشەسازی بێ سەرمایە ناهێتە دامەزراندن.

**سەرمایەژی ژێدەرێ ژ دوو لایا بۆدهێت كو پێكدهێت ژ :**

١- ئەو خەرجیا كو حكومەت تەرخان دكەت بۆ دامەزراندنا كارگەها ، وئەڤ پیشەسازیە كو ب پارێ حكومەتێ دهێتە دامەزراندن دبێژنێ كەرتێ پیشەسازیا گشتی ؟

هەژی گۆتنێ یە و ئەو پارێ كوبۆ هەرێما كوردستانی هاتبوو تەرخان كرن ل سەردەمێ بەعسیا یێ كێم بوو ، بەلێ نهۆ پێشبینیا پاشەرۆژەكا گەشبینر د ڤی بیاڤیدا دهێتە كرن .

٢- خشتنەكارو و ە بەرهێنانا تایبەت : ئانكو ئەو پارێ كۆ هاولاتی ژ سامانێ خۆ بۆ دامەزراندنێن پیشەسازی تەرخان دكەن ، ئەڤەژی گەلەك كێم بەرچاڤت دكەڤیت هاولاتی كێمتر بەرێ خو ددەنە ڤی كەرتێ ئابووری پتر پارێ خۆ دبیاڤێن چاندنێ و بازرگانیێ و گهورینا دراڤی و خانوبەرا دا بكار دئینن.

## جورێن پیشەسازی د هەرێما كوردستانێ دا :

چەند جۆرەك ژ جۆرین پیشەسازیێ ل هەرێما كوردستانی هەنە ئەڤ جورە ژی پێكدهێن ژ :

١- پیشەسازیا خوارنێ : کو ڕێژا ٣٩٪ ژ شەنگستێ پیشەسازیا هەرێمێ پێك دئینیت.

٢- پیشەسازیا ڕستنێ: کو ڕێژا ١٦,٥٪ ژ شەنگستێ پیشەسازیا هەرێما کوردستانێ پێك دئینیت.

٣- پیشەسازیا بەرهەمێن کانزایێ: ئەوژی ڕێژا ١٦,٥٪ پێك دئینیت .

٤- پیشەسازیا کیمیاگەری وپترۆکیمیاویی : کو ڕێژا ١٠,٣ بەشداریێ دکەت.

٥- پیشەسازیا کاغەزێ : کو ب ڕێژا ٥,١٪ بەشداریێ دکەت .

٦- پیشەسازیا کەرەستێن بیناسازی .

## چاندن وسامانێ ئاژەلی د هەرێما کوردستانێدا

چالاکییا چاندنێ گرنگیەکا زۆر هەیە چونکی دابین کرنا ئاساییشا خارنێ پشت بڤێ چالاکیێ ڤە گرێدەت کۆ بەروبوومێ چاندنێ پەیوەندی ب ژیان و ژیارا رۆژانە یا خەلکی ڤەهەیە ، د رۆژێن ئەڤرۆدا چالاکیێن چاندنێ د وەلاتێن پێگەهشت د پێشکەفتیترین رێکێن زانستی پەیرەودکەن وئەڤ ولاتە ل پێشیا وەلاتێن جیهانێ دهێن ژلایێ بازرگانیا چاندنێ ڤە ، شارەزاییا چاندنێ لی ژی ژلایێ مرۆڤی ڤە ل کوردستانێ دزڤریتە ڤە بۆ بەری (٩-١١) هزار سالا ، گرنگترین بەرهەم کو مرۆڤی چاندی گەنم و جەهـ بوویە هەتا کو سالێن شێستا ل سەدێ بیستێ ژی چاندن چالاکیا ئێکی بوو ل کوردستانێ بەلێ ل سالا ١٩٧٥ ز هەتا سالا ١٩٨٨ز ژبەر وێرانکرنا پرانیا گوندێن کوردستانی ژ لایێ رژێما بەعس ڤە خەلکێ زۆر ژ ڤێ چالاکیێ هاتە ڤەقەتیان .

**بەروبوومێن چاندنێ یێن گرنگ :**

بەروبوومێ چاندنێ ژ دو لقێن سەرەکی پێك دهێت ، ئەو ژی بەرهەمێ رووەکی و بەرهەمێ ئاژەلینە . بەرهەمێ رووەکی ب خۆ ژی دهێتە دابەشکرن بۆ چەند جۆرێن دی تر وەکی :

١-دەخل ودان
٢-بەروبوومێن پیشەسازی ( نەختێنی)
٣-بەرهەمێن بەقولی
٤-بەرهەمێن رۆندار
٥-سەوزە
٦-رەز و باخ

## ئێك : دەخل ودان

### ١- گەنم :

گرنگترین ئەو دەخل ودانێن ل کوردستانێ دهێنە بەرهەم ئینان گەنمە ، گەنم بەرهەمەکێ زڤستانیە پشت ب ئاڤا بارانێ گرێدەت ، بەلێ ل هەمی دەڤەرێن هەرێما کوردستانێ باران وەکی ئێك نینە ، باران ل باکوری زێدەترە ژ باشوری، ل باشوري باران کێمترە وتێرا رووەکی ناکەت بۆ پێکەهشتنێ لەورا پێدڤی ب ئاڤدانێ یە .

ئەو گەنمێ ل کوردستانێ دهێتە چاندن جۆرا وجۆرە ژوانا ( زەرگۆل ، سپیکە رزاو ، بەقەدراو ، قەندەهاری ، بهاری ) ، بەلێ کەنمێ ( مەکسیباك) ل سالا ١٩٦٤ز ئینایە عیراقێ ول سالا ١٩٦٧ ز دەست ب چاندنا وی کریە ، د کوردستانێدا ب شێوەکێ بەربەلاڤ دهێتە چاندن ب تایبەتی ل وان جها کو رادێ باران بارینا سالانە دناڤبەرا (٤٠٠-٥٠٠) ملم دایە . چاندنا گەنمی پترین رووبەرێ چاندنێ ڤەگرتیە ، بەلێ ل دویف بارو دۆخێ ئەڤ رووبەرە ل سالەکێ بۆ سالەکادی دهێتە گهورین هەروەسا چەندیا بەرهەمی ژی ژ سالەکێ بۆ سالەکادی جوداهی تێدا هەیە .

### ٢- جەهـ :

ئەڤ دەخل و دانە ژلایێ گرنگییڤە پشتی گەنمی دهیت . بەرو بوومەکێ زڤستانیە، ب وێ چەندێ دهێتە نیاسین کو بەرگریا سەقایێ دژوار دکەت وەکی نزمبوونا پلا گەرمێ و کێم بارانێ وسوێراتیا ئاخێ ، ژبەر هندێ جهێ چاندنا جەهی دکەڤیتە وان جها کو دکێم بەرن .

ژ گرنگترین جۆرێن جەهی د کوردستانێدا ( جۆرێ رەشکەیە) جەهـ ژی وەکی گەنمی رووبەرێ دهێتە چاندن و بەرهەم وبەرێ هەر دونەمەکێ ژسالەکێ بۆ سالەکادی دهێتە گهورین .

### ٣- برنج :

برنج بەرهەمەکێ خارنێ یێ سەرەکیە د کوردستانێدا ، بەرو بوومەکێ هاڤینیە ، و ژێدەرەکێ داهاتیە بۆ وان خێزانێن بەرهەم دئینن ، بەلێ هەتا نهۆ هندەك گرفتا دبیت لەورا سالوخەتێ پاشکەفتنێ پێڤەدیارە .

دڤێت ئەو بهێتە زانین کو بەرێ ئێك دونەم دچاندنێدا برنجی گەلەك پتر ژ بەرێ ئێك دونەما گەنمی یان جەهی ، ئەگەر ئەردی باش بهێتە سەخبێرکرن و بکارئینان، رووبەرێ برنجێ چاندی وبەرهەمێ ب دەست ڤەئینای وبەرێ ئەردی ل هەمی جها وەکی ئێك نینە د کوردستانێدا .

هەروەسا هەمی سالاژی وەکی ئێك نینە ، بەلێ یا بنەجە ئەوە کو باکورێ هەرێما کوردستانێ ب چاندنا ڤی بەروبوومی پتر یا سەرکەفتیە لەورا ئەڤ بەرهەمە گەلەك ل دەشتێن هەریرو دیانا و دەڤەرێن باڵەکایەتی ل پارێزگەها هەولێرێ ول دەشتا شارەزوو ودەشتا بیتوێن ل پارێزگەها سلێمانیێ ول دەڤەرێن سێمێل و سلێڤانی ل پارێزگەها دهۆکێ ول ئاکرێ وشێخان و ل پارێزگەها موسل دهێتە بەرچاڤ.

## دو : بەرهەمێن نەختێنی

ئەڤ بەرهەمە ژی چەند جۆرەکا ب خۆڤەدگرن وەکی پەمبی کۆ دپیشەسازیا رستن و چنینێدا بکار دهێت ، هەروەسا روین ژ دنکێن وێ

دهێته دەرئێخستن و ل پیشەسازیا ڕوینێ رووەکی و سابوونێ دا دهێته بکارئینان. وپاشمایوێن دیێن پەمبی وەك ئالیك بۆ ئاژەلی ب کاردهێت .

## گرنگترین جۆر :

١- **پەمبی :** پەمبیێ چاندی د کوردستانێدا ژ جۆرێ (کوکروست)ە ، هەژی گۆتنێ یە ل سەر ئاستێ عیراقێ پارێزگەهێن هەرێما کوردستانێ ل رێزا پێشییێ دهێن دبەرهەمئینانا پەمبیدا ، رێژا پشکداری کرنا پارێزگەهێن هەولێر و سلێمانیی و کەرکوك د بەرهەمێ پەمبی دانزیکی ٧٥٪ بوویە ل سالا ١٩٧٩ز لسەر ئاستێ عیراقێ .

٢- **تویتن :** ئەڤ بەروبوومە ل عیراقێ تنێ ل هەرێما کوردستانێ دهێتە چاندن ب تایبەتی ل دەڤەرێن باکور و باکورێ رۆژهەلاتا هەرێمێ کو بلنداهیێن وان دناڤبەرا ٥٥٠ – ١٢٠٠ م لسەر ئاستێ روویێ دەریایێ . پارێزگەها سلێمانییێ ل رێزا پێشییێ دهێت ب رێژا ٨٥٪ و پارێزگەها هەولێرێ ل رێزا دووێ دهێت ب رێژا ١٤ ٪ و دهۆك ب رێژا ١٪ دهێت ژلایێ سەرجەمێ تویتنا هاتیە بەرهەمئینان ل هەرێما کوردستانێ د سالا ١٩٩٠ ز دا .

دو جۆرێن سەرەکی یێن تویتنێ ل هەرێما کوردستانێ دهێنە چاندن ئەوژی تویتنا روژهەلاتیە و تیتنا ڤێرجینی ، هەژی گۆتنێ یە کو پارێزگەها هەولێرێ ل رێزا ئێکێ دهێت سەبارەت تویتنا ڤێرجینی و پارێزگەها سلیمانییێ ل رێزا ئێکێ دهێت سەبارەت ب تویتنا روژهەلاتی .

## سێیێ : ڕووەکێن بەقولی :

جۆرێ سەرەکیێ ڤی رووەکی د هەرێما کوردستانێدا نۆکە و پشتی وێ ژی جۆرێن دی دهێن وەکی باقلك و لۆبیك .

سەبارەت نۆکێ ، ئەڤ بەروبوومە بەروبوومەکێ زڤستانیە پشت ب ئاڤا بارانێ گرێددەت ئەو جۆرێن ل کوردستانێ دهێتە چاندن ژ جۆرێ خو جهی نە وەکی جۆرێ سلێمانییێ و جۆرێ دهۆکێ . ل ڤان سالێن داوییێ دا جۆرەکێ دی ژی هاتە چاندنکو پیچەك ددرێژن وبەرگریا نە خوشی و دەردا دکەن ، چاندنا ڤی رووەکی ل ئاخا دەڤەرێن باکور و باکورێ روژهەلات ول ناڤەراستا کوردستانێ یا سەرکەفتیە جونکە ئەردێ وان بکێرڤی رووەکی دهێت .

## چار : بەرهەمێن رووندار :

ئەو بەرهەمن یێن مفا ژ دندکا وان ب دوهن دهێتە وەرگرتن ود پیشەسازیێن خارنێدا دهێتە بکارئینان ، جورێن وێ ئەڤەنە

### ١- گولبەرۆژ:

گۆلبەرۆژ بەرهەمەکێ هاڤینیە ل هەمی پارێزگەهێن کوردستانێ دهێتە چاندن ، هەردو پارێزگەهێن سلێمانیی و کەرکوکی ل پێشیا پارێزگەهێن کوردستانێ دهێن ژ لایێ چاندنا کۆلبەرۆژا ڤە .

### ٢- کونجی :

کونجی ژوان بەرهەمانە کو دگەلەك بیاڤادا ب کاردهێت ، ڕاستەو خۆ دهێتە خارن یان دکەنە حەلاوە وشریناهی یان ڕینی ژێ دەردئێخن کو ڕێژا ٥٠٪ زێدەتر ڕین تێداهەیە .

دەڤەرێن هەرێما کوردستانێ ل پارێزگەها دیالا ل پێشیا پارێزگەهێن هەرێمێ دهێن ژلایی رووبەرێ چاندی وبەرهەمێ ب دەست ڤە ئینای ژی ڤە . پارێزگەها موسلێ ل رێزا دووێ دهێت و پارێزگەها هەولێرێ ل رێزا سییێ دهێت .

## پێنج : زەرزەوات

زەرزەوات ئێکە ژوان بەرهەمێن چاندنێ یێن ل کوردستانێ دهێتە چاندن ژ لایێ کرنگیێڤە پشتی دەخل و دانی دهێت ، زەرزەوات دبیتە دو بەش .

### ١-زەرزەزاتێ هاڤینێ:

ئەڤ جۆرە ژ باجان وخیار و باجان رەشك و باميا وگندۆر وشڤتی وبیبەر(فلفل) وكولندكا پێك دهێت ،باجان ل پێشیا هەمی جۆرێن دی دهێت ژ لایێ رووبەرێ چاندی ڤە ژ ئەردێ چاندنی چونكە داخازی لە سەر زۆرە.

بەرهەمێ باجان ل پارێزگەها هەولێر ب رێژا ٦٤٪ دناڤبەرا هەرسێ پارێزگەهێن هەولێر وسلێمانیێ ودهۆك دا ل سالا ١٩٩٠ز دهێت بەبی زەرزەواتێن دی دهەمان سالدا ئەو رووبەرێ كو چاندی ل پارێزگەها سلێمانیێ زێدەتر بوویە دگەهشتە(٤٠٧٢٩) دۆنەما و پارێزگەها هەولێرێ ل رێزا دووێ هات ب (٣٨٠٨٤) دۆنەما و پارێزگەها دهۆكێ ل رێزا سیێ دهات رووبەرێ (٢٧٦٨) دۆنەما.

### ٢- زەرزەزاتێ زڤستانێ:

ئەڤ جۆرێ زەرزەواتی ژی گەلەك ب بهانە و پێك دهێن ژ(شێلمدر، شێلم ، پیڤاز ، گێزەر ، خەس ، كەلەمی ، سپێناخ ، و زەرزەواتێن دی).

رووبەرێ چاندی ژڤان جۆرێن زەرزەواتا دەڤەرەكێ بۆ دەڤەرەكا دی جوداهی تێدا هەیە ،پارێزگەها هەولێرێ ل رێزا پێشیێ دهێت لپەی ئامارێن سالا ١٩٩٠ز ب رووبەرێ (٣٢٣٦) دۆنەما یە لێ ئەو رووبەرێ ل سلێمانیێ هاتیە چاندن بتنێ (٩٦٦) دۆنەم بوون.

رووبەرێ چاندی ژ زەرزەواتێ زڤستانێ ل پارێزگەها موسل ل سالا ١٩٧٧ز گەهشتیە (٢٩١٨) دۆنەما ول پارێزگەها دیالا ل سالا ١٩٧٥ز گەهشتیە (٢٦٧٦) دۆنەما.

## شەش : فێقی

بنەمایێن جوگرافیا سروشتی ل هەرێما کوردستانێ هاریکاریا پەیدابوونا ڤی جورێ چالاکیا چاندنێ دکەت چ ل دەڤەرا دشتایی بیت یا ل دەڤەرا چیایی.
ل بنار وبەتەنێن چیا دارا مێوێ و گیزێ وهرمیکی وهتد دهێنە چاندن ئانکو ل وان دەڤەرێن کو باران دناڤبەرا(٥٠٠ - ١٠٠٠) ملم لێ دباریت، ژبلی ڤان دارا دارێن دی ژی لێ شین دبن وەکی هژیرو هرمیك وخۆخ وگێلاس وتی.
ب شێوەکێ گشتی دشێین بێژین کو تێکرا دەڤەرێن کوردستانێ ب کێر چاندنا دار وبارێ ب بەردهێت .

هەر دەڤەرەکا ل کورەی ژینگەها خۆ یا جوگرافی یا تایبەتمەندە ب چاندنا جۆرە فێقیەکێ تایبەت :بۆ نموونە دەڤەرێن باشورێ هەرێمێ دشیاندا هەیە تەرخان بکەین بۆ چاندنا دارخورما و مزاتیا ئانگو (ژبەدرە و مەندەلی و جەلولاء و قزل رەبات) د دەمەکی دا دەڤەرێن باڵەکایەتی و هەورەمان و دەوروبەرێن وان یا تایبەتمەندە ب چاندنا دار گیزێ و دەڤەرێن دهۆکێ ژی سێڤ لێ دهێنە چاندن.
کرنگترین دارا چاندی ل کوردستانێ (تری)یە ب هەمی جۆرێن وێ ڤەکو ل سەرانسەرێ هەرێما کوردستانێ هەیە ، هەروەسا سێڤ ژ فیقیێن

کرنگه ل پارێزگەها دهوکێ و هەروەسا هژیر کو زێدەتر پارێزگەها موسلێ یا پێ ناڤدارە :

ل پارێزگەها دیالا ژی مزاتی ودارخورما وهنارا لێ دچینن ، بەلێ ژ بلی وان دەڤەرێن ك ب جورەکێ فێقی دناڤدارن چاندنا فیقی داب ونەریتەکێ کوردەواریە ل سەرانسەری کوندێن دەڤەرێن چیایی د کوردستانێدا ل پارێزگەهێن موسل ودهۆك وهەولێر وسلێمانیێ هەیە. ب گشتی بەرهەمێ رووەکی د کوردستانێدا یێ پاشکەفتیە ئەگەر بەراوردکەین دگەل وەلاتێن پێشکەفتی هەر چەندە سەقایەکێ زۆر گونجای هەیە بۆ چاندنا جۆرێن جودا جودایێن رووەکی.

## سامانێ ئاژەلی:

سامانێ ئاژەلی د کوردستانێدا پێك دهێت ژ خودانکرنا چەند جۆرێن ئاژەلی کو ژ پەز و چێل وگامیشا وپەلەوەرا پێك دهێن ،دڤێرەدا دێ باسێ ئەوان ئاژەلان و دابەش بووناوان یا جوگرافی ل هەرێما کوردستانێ کەین.

### ١- میه :

ئەو جۆرێ میها کو ل کوردستانێ هەێ ب میها کوردی ناڤدارە، وجورەکا دی هەیە ب پلا دووێ دهێت کو ب ناڤێ حواسی ناڤدارە

### ٢- بزن :

دو جۆرێن سەرەکی یێن بزنا ل هەرێما کوردستانا عیراقێ هەنە ئیك ژوان بزنا مەرەزە ویا دی تر بزنا ئاسیایی یە.



وێنێ میه و بزنا

### ٣- چێل :

چێلێ مفایەکێ ئابووری یێ مەزن هەیە ، مفا ژ شیرو گۆشت وپیستێ وێ دهێتە وەرگرتن ،ولاتێن پێشکەفتی گەلەك پویتەی پێ دکەن ،بەلێ ل کوردستانێ هەتا نهۆ ئەو پویتە پێ نەدایە ب تایبەتی ژلایێ کەرتێ کشتی ڤە .

**پەلەوەر :-**

ب شێوەکێ گشتی پەلەوەر ژ مریشك و قاز و وەردەك و عەلوكا پێك دهێن، چێدبیت ل گوندا چ مال نەبن ئەگەر جۆرەك یا دو جۆر یان سێ جۆر ژڤان جورێن پەلەوەرا نەبن بەلێ ژ وانا مریشك ژهەمیا كرنگترە ژلاییێ پشكداریكرنێ دچالاكیێن ئابووری دناڤ بازارادا ، هەژی گۆتنێ یە كو گۆشتێ مریشكێ و هێكا وەردەكا داخازیەكا زۆر ل سەرە ژلاییێ ئاكنجیێن كوردستانێ ڤە لەورا هەرچەندە ژمارا پرۆژێن مریشكا گۆشتی گەهشتیە (٤٦١) پرۆژا كو سالانە نزیكێ (١٨,٥) ملیون مریشكا بەرهەمئینان بەلێ دیسان چەندەكا زۆر ژ گۆشتێ مریشكا و هێكا ژ ولاتێن جودا جودایێن جیهانێ دهێنە كرین و دینن بازارێن سەرانسەرێ باژێرو باژێركێن كوردستانێ ، هەروەسا ژمارا هێكێن مارق ل دەوروبەرێن (٨) دایە كو بەرهەمێ سالانە (٢٠) ملیون چیچەلۆكن .

## راهێنان

بۆ پێشڤەبرنا  سامانێ ئاژەلی

و رزگار بوونێ ژ ئاستەنگ وگرفتا

دشیانداهەیە:



## سەیران و گەشت وگوزار

سەیران وگەشت وگوزار چالاکیەکا ئابووری یا زۆر کرنگە، ئەڤ کرنگیە ژی د پێشڤە چوونێدایە مل ب مل دگەل پێشکەفتنا شارستانی و ئاستێ رەوشەنبیری و شیانێن ئابووري.

**بنەمایێن سروشتی :-**

ل دەڤەرێن چیایی شیانەکا گەشت و گوزاریا سروشتیا زۆر مەزن تێداهەیە ژ بەر جوانیا دیمەنێن سروشتی و ب ئەگەرا هندێ کو کەش وهەوایەکێ پاقژو هێمنانە هەیە وپرن ژ کانیا و ژێدەرێن ئاڤێ . بۆ نموونە سیلاڤێن گەلی عەلی بەگ و بێخال لپارێزگەها هەولێرێ و ئەحمەد ئاوا ل سلێمانیێ و ئاشەوا و ئینشکێ و سولاڤ ل دهۆکێ ، هەروەسا شکەفتێن کەڤن ژی جهێن سەرنج راکێشن وژڤان شکەفتا شکەفتا کونەبا و قزقایان و زەرزی و هەزارمێرد ل پارێزگەهاسلێمانیێ و شانەدەر و دەرگەلە و کونەبا ل پارێزگەها هەولێرێ ،وچارستین وهەلامەتا و ئینشکێ ل پارێزگەها دهۆکێ . هەروەسا هەبوونا چەندین رووبارێن مەزن وەکی خابوور و دیجلە وزێێ مەزن و زێێ بچووك ب تایێن وان ڤە.

سەقایێ کوردستانێ ژی بنەمایەکێ دی یێ پالدەرە بۆ پێشڤەبرنا گەشت وگوزار ب درێژیا سالێ ، ل هاڤینا یا هینە ب تایبەتی ل دەڤەرێن چیایی و ئەسمان هەردەم ساهیە هەوا ژی یێ پاقژە د هەمان دەمدا

زڤستانێ بەفردباریت و ژبەر هندێ چەندین دیمەنێن جوان لێ دروست دبن ، وشیانداهەیە وەرزشا سەر بەفرێ ژی دڤی وەرزیدا بهێتەکرن .

هەروەسا هەرێما کوردستانێ یا دەولەمەندە ب ڕووەکێ سروشتی ب تایبەت ب وان دارستانێن کو ل دەڤەرێن چیایی هەین

## بنەمایێن مرۆڤی:-

ل هەرێما کوردستانێ چەندین شیانێن گەشت وگوزاریێن مرۆڤی تێداهەنە کو دبنە ئەگەرێ راکیشانا گەشتیارا، ژ هەمیا :

١- هەبوونا شووێنوارێن گرنگ وکەڤن وەکی کەلا هەولێرێ و کەلا کەرکوکێ وب دەهان کەلاێن بچووکێن دی ، هەروەسا هەبوونا شکەفتا شانەدەر کو پاشماوێن هەستیێن مروڤێ نیاندارتال تێدا دیتینە کۆ مێژوویا وان دزڤریتە (٤٥٠٠ – ٦٠٠٠ ) سالا بەری نهۆ .هەروەسا کەڤنترین گوندێ چاندنێ (گوندێ چەرموو). هەروەسا شوونوارێن میرنشینێن کوردی وەکی سۆران و بادینان و شوونوارێن سەرکردێ مەزنێ کوردێ موسولمان سەلاحەدین ئەیوبی ، زێدەباری هەبوونا کەڤنترین باژێر ك ب باژێرمابیت ئەو ژی (هەولێر) پایتەختێ هەرێما کوردستانێ یە .

**چالاکی :** گرۆپەك ژ قوتابیا نەخشەکێ سەر دیواری ل سەر بابەتێ بنەمایێن مرۆڤی ئامادە بکەن .

٢- هەبوونا مەزارێن ئایینی و گورێن چاکا.

٣- هەبوونا پیشەسازی و هونەرێ فۆلکلوری .

٤- هەبوونا چەندین جهێن گەشت وگوزاری وەکی ئوتێل وگوند و خارنگەه و گازینوین گەشت و گوزاری .

٥- هەبوونا چەند پارکەکا وەکی پارکا هەولێر ،ونهۆ چەند پارکێن دی ل بەر دروست کرنێ نه .

ل سەر ڤان بنەما ژمارەکا هاڤینگەها سەر هلدایە وەکی (سەرسنك ، سوارەتووکا، زاویتە ، سۆلاف ،شەرانش ل پارێزگەها دهوکێ .... ( سەلاحەدین ، شەقلاوە، جوندیان ،بێخال ، حاجی ئۆمەران) ل پارێزگەها هەولێرێ ..... ( سەرچنار ، دۆکان ،ئەحمەد ئاوا ، تەوێلە ،بیارە) ل پارێزگەها سلیمانییێ .

## ڤەگوهاستن و هاتن و چوون

دڤی بابەتیدا دێ باسێ جۆرێن رێ وریێبارا دکین ،بێگومان ئەڤرۆ ئێك ژ وان پیڤەرێن كو رادێ پیشكەفتنا هەر ولاتەكی پێ بزانین رادێ چریا رێ وریێبارا یە ب هەمی جۆرین خۆ ڤە (ئەسمانی ،هشكاتی ، رووبار ، دەریایی ،رێكا بوریا ........) هندی تۆرێ رێ وریێبارا یا چرتربیت ئەڤە دبیتە نیشانەك لسەر پێشكەفتنا وەلاتی ، ب راستی رێ وریێبار بشاەمارا ژیانێ دهێتە دانان ژ هەموو لایەكی ڤە ل هەرێما كوردستانێدا دابەش دبنە سەر ئڤان جۆرێن خارێ:

### ١- رێ و ریێبارێن :

بێگومان ئەڤ جۆرە جۆرێ رێكا ترومبێلا یە ئانكو رێكێن قێركری وجۆرێ شەمەندەفرێ ژی ڤەدگریت ئانكو هێلا ئاسنی . ل هەرێما كوردستانێ ئەڤرۆ بتنێ جۆرێ ئێكێ هەیە ئانكو (رێكێن قێركری و رێكێن نە قێركری) ڤان رێكا چەند جۆرێن هەنە وەكی رێبێن نێڤ دەولەتی كو بازێرێن كەركوك و هەولێر و سلێمانی و دهۆك و میسل وب سنۆرین نێڤ دەولەتیێن هەرێما كوردستانێ ڤە گرێدەت دگەل ئیرانێ و سوریا و توركیا و بەغدا پایتەختێ عیراقێ ، جۆرەكێ دی ژی هەیە كوبهایەكێ كێمتر هەیە ، ئە ڤە ژی سەنتەرێ پارێزگەها ب سویتەری قەزا و ناحیا ڤە گرێددەت و جۆرەكێ دی ژی هەیە كو نەهاتینە قێركرن كو ریێكێن ئاخێ نە و گوندا پێكڤە گرێددەت .

**چالاكی :** گرۆپەك ژ قوتابیان راپۆرتەكێ لسەر (ڤەگۆهاستنا هاتن وچوونێ) بۆ وانا بهێت ئامادە بكەن .

### ٢- رێیێن ئەسمانی ( هێلێن ئەسمانی ) :

ئەڤ جۆرێ رێ پشتی ژناڤچوونا رژێما بەعس ل ٢٠٠٣ز ل هەرێما کوردستانێ پەیدا بوو ، ونهۆ هەردو فرۆکەخانێن نیڤ دەولەتیێن سلێمانی و هەولیرێ ئامادەنە بو گەشتێن ئەسمانی ل سالا (٢٠٠٥) بۆ جارا ئیکێ د مێژوویا کوردستانێ د حەجیێن مالا خودێ ژ پارێزگەهێن کوردستانێ ژفرۆکەخانا هەولێرێ یا نێڤ دەولەتی بۆ فرۆکەخانا (جدده) یا نێڤ دەولەتی ل عەرەبیتانا سعودێ و بەروڤاژی ژی سەفەرکر .

سەبارەت ب رێیا رووباری ئەڤ جۆرێ رێکا هەتا نهۆ چ مفا ژێ نەهاتیە وەرگرتن ل هەرێما کوردستانێ زێدەباری هەبوونا چەندین رووبارین مەزن وەکی دیجلە و زێێ مەزن وزێێ بچووك و زێێ دهۆکێ و سیروان .....هتد .

دشیاندا هەیە بێژین کو هەرێما کوردستانێ وەکی سەرانسەری عیراقێ دوارێ رێکیێن هاتن و چوونی زۆرا پاشکەفتی ،ئەگەری ڤێ ژی دزڤریت بۆ سیاسەتا پاشکەفتیا شەرخوازانەیا رژێما بەعسا ژناڤچووی . لەورا ئەڤرۆ ئەرکەکێ مەزنێ لسەر ملێن کوردستانیا ژ لایێ گرنگی دانێ ب هەمی جۆرێن رێ ورێبارا ڤە،ئەگەر مە بڤێت مە ولاتەکێ جوان و پێشکەفتی و ئێککرتی و ئاڤەدان هەبیت.

## کوردستان ل سەردەمێ مەغۆلیان ( ئیلخانی و جەلائیری )

### مەغۆل :

مەغۆل کومەکا هۆزێن ئاکنجیێن دەڤەرێن ناڤەراستا ئاسیا ( ب تایبەتی مەنغولیا و دەوروبەرێ وێ ) بوون ، چ ژبەر ژینگەها ب زەحمەتا بیابانێ یا هشك و ب کۆچەری ژیانا خۆ دناڤ چادرو رشمالا بوراند وڤەگەهاستن کرن دناڤ دەڤەرێن گەرم و زوزانان ل وەرزێن سالێ ود جەنگێن خۆدا کوشتن وتالانکرن ئەڤجا ژبەر هندێ ب مللەتەکێ توندرەو و تێکدەر د مێژوویێدا بەحسێ وان د دهاتەکرن.

ل دەوروبەرێ سالا (١٢٠٦)ز وەکی هێزکا کارتێکەرا سەربازی وسیاسی دەرکەفتن ئەو ژی دەمێ کو سەرکردێ وان یێ ناڤدار (جەنگیزخان) شیای هەمی هۆزێن مەغولان بکەتە ئێك و پاشی ولاتێن چینێ ولاتێ ل پشت رویباری ( بلاد ماوراء النهر) و خوراسان وفارس وئازەربیجان و دەڤەرا قەفقاس داگیر بکەت .

ل دەسپێکا لەشکر کێشیا مەغولان بۆ سەر کوردستانێ دزڤریت بۆ سالا ١٢٢١ز دەمێ چەند هەرێم وباژێرێن روژهەلاتا کوردستانێ داگیر کرین هەرچەندە کو کوردان خۆ نەدا دەستی و بەرهنگاریا وی کر و بەرخودانەکا زور نیشاندا هەروەکی ئاکنجیێن باژێری ( مەراغە) ل رۆژهەتا دەریاچا ئورمیێ دەمێ بو ماوێ چەند روژان بەرسینگێ دۆرپێچا دژوارا مەغولان بو سەر باژێرێ وان کری .

هەروەسا سالا ١٢٣١ز مەغولان لەشکەرەکێ مەزن هنارد بۆسەر شارەزۆر بەلێ ژبەر ئەوێ کو سولتانێ هەولێرێ و خەلیفێ عەباسی لەشکرەك ئامادەکر بۆبەرهنگاریا هێرشا وان ئێدی مەغولان خۆ ڤەکیشان ، لگەل ئەوێ چەندێ مەغولان سالا ١٢٤٥ز هێرشەکا مەزن وبەربەلاڤ

کرە سەر شارەزۆر وخەلکەکێ زۆر کوشتن و باژێر کاڤلکر ، هەر ژبەر ڤێ چندێ ئەو بوو هندەك ژ ئاکنجێن شارەزوو گەلەك دەڤەرێن دی ناچار بوون وەلاتێ خۆبجه بهێلن و بەرەڤ وەلاتێ شامێ بچن .

پشتی ئەڤێ ئیدی مەغولان لبن سەرکردایەتیا هۆلاکۆی خۆ ئامادەکرن بو داگیرکرنا بەغدا ، بەری ڤێ چەندێ باژێرێ کرماشان ل رۆژهەلاتا کوردستانێ تووشی کاڤلکرنێ ببو ب دەستێ مەغولان چونکی کەفتبوو سەر رێکا هێرشا مەغولان بو سەر بەغدا ، کو وهۆلاکۆی سالا ١٢٥٨ز شیا داگیر بکەت و داوی ب خەلافەتا عەباسی بهینت و دووماهي خەلیفێ عباسی (المستعصم بالله) بکوژن و چل روژان دەست ب کوشتن وسۆتنێ و کاڤلکرنێ و تالانێ کرنێ کرن.

هەر ئەڤێ سالێ ، هۆلاکۆی لەشکرەکێ مەزن ب سەرکردایەتیا ( ئەرقیتونێ ) هنارد بۆ داگیرکرنا قەلا هەولێرێ ، بەلێ کورێن قەلایێ شیان لەشکرێ هۆلاکۆی راوەستینن و بوماوێ زێدەتر ژ شەش هەیڤان بەرسنگێ دۆرپێچا مەغولان بگرن هەر چەندە د تەنگاڤیێ و برسێ ونەخوشیێ دا بوون ، ل دوایێ هۆلاکۆ ب هاریکاریا لەشکرێ حاکمێ میسلێ ( بدرالدین لۆلۆ) کو ئالیگریا خۆ بۆ هۆلاکۆی راگەهاندبوو ، شیان قەلا هەولێرێ بدەنە بەر مەنجەنیقان و دەرزو کۆران بێخنە شویرە کەلێ ، وپاشی داگیرکر و هژمارەکا مەزن ژ خەلکێ وێ کوشتن.

پاشی لەشکرێ مەغولان بەرەڤ باکورو رۆژئاڤایێ کوردستانێ چوون و باژێر (میافارقین) کو ئێك ژ وان باژێرێن کوردی ل باکورێ کوردستانێ بوو کو لبن سەرکردایەتیا مەلك کامل ئەیوبی بوو شیا بۆ ماوێ دووسالان بەرسنگێ

دۆرپێچکرنا لەشکرێ مەغۆلی راوەستن ، بەلێ برساتیێ و نەخوشیێ و گرانی و بەرتەنگی کەفتە ناڤ ئاکنجیێن باژێرێ تووشی کارەساتێن مەزن بوو نەڤە .
ژڤی لایی ژی ب فەرمانا هۆلاکۆی ب لەشکرەکێ زێدەتر مەغولان هێرش کرنە سەر ئەڤی باژێری ئەڤان هۆیان ب گشتی وەکر کوهلاکۆ ئەڤی باژێری بشتی بەرگیریەکا مێرانە بستینیت و ( مەلك کامل ) ژی ب ئێخسیری کەفتە دەستێ هۆلاکۆی ب زولم و زۆری شەهیدکر و خەلکەکێ زۆرێ ڤی باژێری ژی کوشتن.

**دیارترین ئەو ئەگەرێن کو وەکری کوردستان پتر بکەڤیتە بەر هێرشێن مەغۆلانن ئەڤەنە .**

١- تەماعکاری و گیانێ بەرفرەهـ بوونا خوزیا مەغولان بۆ دەست ب سەرداگرتنا ب سەر باژێر و ئاڤەدانا ڤێ دەڤەرێ و پێخۆشبوون ب خێروبێرێن کوردستانێ .
٢- هەبوونا دەست هەلاتا چەند هێزەکا ل وێ دەڤەرێ وەکی خەوارزمیان کو دوژمناهی ل گەل مەغۆلانن هەبوو ، وەکر کو کوردستان ببیتە مەیدانەك بۆ شەرۆ پێکدادانێ و دوبەرەکیێ .
هەژی گوتنێ یە دەولەتا خەوارزمیا کو ئێك بوو ژوان دەست هەلاتدارێن موسلمانان بوو کو حوکم ل بلاد ما وەراء النهر و خوراسان دکر ، و ب هەلوەشاندنا ئەڤێ دەولەتێ ب دەستێ مەغۆلان رێك خوش کرنەك بوو بوستاندنا کوردستانێ و پاشی بەغدا .
٣- گرنگیا کوردستانێ وەکی رێکەك وپاشی دەرگەك، بو بۆ مەغۆلان کو برێکا وان بگهەنە بەغدا وەلاتێ شامێ . پشتی ئەڤان لەشکرێ هۆلاکۆی بەرەڤ باژێرێن وەلاتێن شامێ چو و هەر تشتێ ژلایێ شارستانی و ئاڤەدانی ڤە هەبوو هەمی ژناڤبرن ، بەلێ فەرمانروایا میسرێ کومەمالیك بوون شیان ل شەرێ ( عین جالوت) دا ل نێزیکی عەکا ل سالا

۱۲٦۰ز لەشکرێ هۆلاکۆی بشکێنن وئێدی هێرشێن مەغۆلان ل وی سنوری براستینن . دڤی شەریدا کوردێن رۆژئاڤاییێ کوردستانێ و کوردێن وەلاتێ شامێ رۆلەکێ گرنگ هەبوو مل ب ملێ مەمالیکاڤە بۆ شکاندنا مەغۆلان . ب ڤی شێوەی سەرانسەرێ کوردستانێ ودەڤەرێن دەوروبەر بوونە پارچەك ژ دەولەتا مەغۆلی ئێلخانێ .

## راپەرینێن کوردا :

پشتی داگیرکرنا مەغۆلان کوردان سەرێ خۆ شۆرنەکر بۆ بیانیان و داگیرکەران، ب بەرۆڤاژی چەندین راپەرینان ل دەڤەرێن جودا جودا ل کوردستانێ سەرهلدا بەرامبەری مەغۆلان ، ژوان ژی کوردێن میسل سالا ۱۲٦۲ز شیان لەشکرێ مەغۆلان ژ باژێرێن میسل دەربێخن وباژێری ژێ پاقژ بکەن .

دەمێ مەغۆلان لەشکرێ زێدەتر هنارتی بو گرتنا ئەڤی باژێری کوردێن ئەڤی باژێری ب ئازایی و زیرەکی خۆ دیارکر . هەروەسا هەڤلێرێ ژی (ئەربل) ئارامی ب خۆڤە نەدیت ژبەر راپەرینێن بەردەوامێن کوردان کو گرنگترین ژوان راپەرینا ساربازگەگێ هەڤلێر بوو کوماوێ سێزدە سالان ڤەکێشا .

کاودانێن کوردستانێ و دەڤەرێن ژێر دەست هەلاتا دەولەتا ئێلخانیان مەغۆلان ل بن بارێ ئەڤێ سیاسەتا زلم زورداری و نەئارامی ، مایە هەتا کو مرنا ئێلخانێ نەهێ سولتان (ئەبو سەعید بهادرخان) ل سالا ۱۳۳٦ز کو کەس ل دویڤ خۆ نەهیلابوو کوجهێ وی بگریت ژبۆ فەرماندەواییێ ژبەر هندێ سەرکردەکێ دی یێ مەغۆلان کو ناڤێ وی شێخ حەسەن بوو سەرۆکێ هۆزا جەلائیری مەغۆل بوو، دەستهەلات ئێخستە بن دەستێ خۆ .

## دەولەتا جەلائیری :

دەولەتا جەلائیری ل سەر دەستێ شێخ حەسەنێ جەلائیری ل سالا ١٣٣٦ز هاتیە دامەزراندن کو عیراق و پتریا هەرە مەزنا ئاخا کوردستانێ ڤەگرتیە ، باژێرێ بەغداژی پایتەختێ ئەڤێ دەولەتێ بوو ، کو حەتا سالا ١٤١١ز حوکمرانی ل ڤێ دەڤەرێ یا بەردەوام بوو .

## تەیمۆرلەنگ :

چەند سالەك ژبەری ژناڤبرنا دەولەتا جەلائیری سەرکردەکێ دی یێ مەغۆلان کو ناڤێ وی (تەیمۆرلەنگ) بوو هێرشەکا مەزن ژ ( بلاد ماوەراء النهر ) دەست پێکر و ئیران وعیراق و بەشەکێ زۆرێ کوردستانێ ستاند حەتا کو گەهشتیە ناڤەراستا ئەنادۆلێ ، ئەڤی ژی کوشتنەکا زۆر و کاڤلکرنەکا مەزن بکار ئینا د وان دەڤەرێن کو تێدا دەربازبووی ژ وان ژی باژێرێ بەغدا بوو .هەژی گوتنێ یە ئاکنجیێن مێرنشینا لورێ بچووك ل رۆژهەلاتا کوردستانێ شیان گەلەك ب زیرەکی وب جەرگ بەرامبەری پەلەمارو هێرشێن تەیمۆرلەنگی براستن و تووشی شکەستنێ بکەن . بەلێ تەیمۆرلەنگی پشتی ئینانا هێزەکا زۆر و دۆر پێچکرنەکا دژوار دەست ب سەر( خورم ئابادا) دا کرت کو پایتەختێ ئەڤێ میرنشینێ بوو.هەروەسا باژێرێ ماردینێ ل باکورێ کوردستانێ گەلەك ب مێرانی لەشکرێ (تەیمۆرلەنگی) بۆ چەند جاران شکاند بەلێ دووماهی جار ئەڤ باژێرە ژی ب دەردێ باژێرێ ( خورم ئاباد) چوو . هاتە ستاندن .



ویێنێ بازێرێ ماردینێ ل باکورێ کوردستانێ

گەلەك پێڤە نەچو تەیمۆرلەنگ دمریت چارەکادی جەلاییریان ب سەرۆکاتیا ئەحمەدێ جەلائیری دەست ب سەر بەغدا دا گرت بەلێ ئەڤێ جارێ حوکمێ وان کەلەك ڤەنەکێشا ژبەر کو هێزین ( قەرەقوینلۆ) ب سەرۆکاتیا (قەرە یوسف) ل سالا ١٤١١ز دەست ب سەر بەغدا دا گرت .

## کوردستان ل سەردەمێ هەردو دەولەتێن قەرەقوئینلۆ وئاق قوینلۆی:

ل سالا ١٤١١ز هۆزێن قەرەقوێنلۆی (بەرخێ رەش )یێن تورکومانی ب سەرۆکاتیا قەرە یوسف دووماهیێ ب فەرمانروایا دەولەتا جەلائیری بینن دەست ب سەر دەڤەرێن دبن دەستێ وان دا بگرن ، ب ڤی شێوەی عیراق و بەشەکێ زۆرێ کوردستانێ بوونە پارچەك ژ دەولەتا قەرەقوینلۆ . ل سالا ١٤٦٨ز هۆزێن ئاق قوینلۆ( بەرخێ سپی) یێن تورکومانی ب سەرۆکاتیا (ئوزۆن حەسەن) شیان پشتی چەندین شەرو رویب رویبوونان دوماهیێ ب فەرمانرەوایا دەولەتا قەرەقوێنلۆی بینن و دەست ب سەر دەڤەرێن د بن دەستێ وان دا بگرن .

بڤى شێوەى عیراق و بەشەکێ زۆرێ کوردستانێ بوونە پارچەك ژ دەولەتا ئاق قوینلۆى حەتا کو سالا ١٥٠٨ز (ئانکو دەست پێکا چەرخێ شازدێ ) دەست هەلاتا وان درێژى پێداهەتا کو وى دەمێ کو شاە ئیسماعیلێ سەفەوى بازێرێ بەغدا ستاندن و دوماهى ب دەولەتا ئاق قوینلۆى ئیناى.

دڤى ماوەى ژیدا دەڤەرێن ل بن دەست هەلاتا ئەڤان هەردو دەولەتان بوونە مەیدانا شەرو پێك دادانێ ل ناڤ بەرا فەرمانرەوایێن ل سەر دەست هەلاتێ ، ژبەر ڤێ چەندێ ژ پشت گوهڤە هاڤێتن و کاڤلکاریێ جارەکادى ب سەر پتریا ئاخا کوردستانێ و عیراق و دەڤەرێ داگرت، و ل گەل هندێ ژى دا فەرمانرەوایێن هەردوو دەولەتان شیان ب دژوارى دەست هەلاتا خۆ ل سەر کوردستانێ ب سەپینن .

## راهێنان و پرسیار

پ ١/ ئەڤان پێناسە بکە :

(١) شۆرەشا سەربازگەهێن هەڤلێرێ

(٢) مەلك کاملێ ئەیوبى

(٣) مەغۆل

(٤) عەین جالۆتا

(٥) میرنشینا خەوارزم

(٦) شێخ حەسەنێ جەلائیرى

**چالاکى :**

گرۆبەك ژ قوتابیان بەلاڤۆکەکا سەر دیوارى ئامادەکەن.... لایەك ژ کارەساتێن سەردەمێ مەغۆلان لسەر میرنشینێن کوردان د ناڤ بابەتیدا هەبیت .

## دەستهەلاتداریا سیاسیا کوردی ل سەردەمێ مەغوّلان ( ئیلخانی - جەلائیری ):

هەر چەندە کوردستان د مێژوویا دیر و درێژا خوّدا پتر مابوو لبن دەستێ داگیرکەران و بیانیاڤە . بەلێ حەزا سەربەستییێ ژبن دەستێ دوژمنێن کوردا یا بەردەوام بوو ئەڤەژی بویە ئەگەرێ وێ چەندێ کو دەست هەلاتا سیاسیا کوردی ل چارچوڤە و شێوێ جودا جودا دا ل ڤێری وێراهە. سەرهلدەت ببیتە راستیەکا ئاشکرایا وی سەردەمی ئێك ل دویڤ ئێك دمێژوویا کوردستانێدا ب تایبەتی ل سەر دەمێ مەغوّلان ( ئیلخانیان و - جەلائیری ) یاندا، ب راستی سەرهلدان وهەبوونا دەست هەلاتا سیاسیا کوردا و دوی سەردەمیدا بڤی رەنگی بوو ؟

١- میرنشینان .

٢- فەرمانرەوایا کەلان و دەڤەران

٣-سەروّکێن باژێران .

## دیارترین میرنشینێن کوردی یێن ئەوی سەردەمی ئەڤەبوون :

### ١- مێرنشینا لوڕی مەزن ( مێرنشینا فەزلەوی ):

لوڕستان هەرێمەکە پتریا ئەردێ وێ چیاو گرك د زنارن دکەڤیتەە باشورێ روّژهەلاتا کوردستانێ . ژ زاردەڤێ هندەك ژ مێژوونڤیسان هەر ژ چەرخێ دەهێ زاینی دەست هەلاتا سیاسیا کوردی ژ لوڕستان وبەختیاری دەرکەفتیە .

باپیرێ مەزن یێ میرێن بنەمالا لوڕستان ئەبوحەسەنێ فەزلەوی بوو ژبەر هندێ دبێژنە ڤێ میرنشینێ میرنشینا فەزلەوی . پەیوەندیێن سیاسی ل گەل مەغوّلان (ئیلیخانیان - وجەلائیریان) و مەمالیکان پێك ئینان و گرنگی ب حوکم رانی و ئاڤەدانی و خانەدانیێ دایە .

## ناڤدارترین میرێن ڤێ میرنشینێ :

### أ- میرهەزار ئەسپ کورێ میر ئەبو تاهێر محەمەد:

ژ ناڤدارترین میرێن لورستانێ یە ل نیڤا ئێکێ ژ چەرخێ سێزدێ زاینی، گەلەك گرنگی ب لایەنێ ئابوری و ئاڤەدانی وبیناسازیێ دایە ژبەر ڤێ چەندێ خەلیفێ عەباسی ( ناسرلدین الله) نازناڤێ (ئەتابەك) دایێ دەسهەلاتا خۆ بەرفرەهکر هەتا نزیك ئەسفەهان ، ل سالا ۱۲۵۲ ز مرییە .

### ب- نەسرەت دین ئەحمەد:

کو ل دەسپێکا سەدێ چواردێ زایینی فەرمانرەوایی کریە و میرنشین دڤی سەردەمیدا ژلایێ سیاسی وئابوری ڤە گەلەك وەرر کر، وئەمن وتناهی وسەقامگیری بسەر دەڤەرێدا کیشابوو ، ئەڤ میرە ل سالا ۱۳۳۳ز مر.

## ۲- میرنشینا هەکاری :

میرنشینا هەکاری ( هەرێما (چولەمێرگێ ) ل باکورێ کوردستانێ ل چەرخێ سێزدی زایینی پەیدا بوو ، هێز و دەسهەلاتا میرێن وێ هەر ژ زیێ مەزن هەتا دەریا (وان) ێ ڤەگرتبوو ، ل رۆژهەلاتێ ژی گەلەك جاران دەسهەلاتا وێ دگەهشتە سەلماس و خوێ .

بنەمالا میرێن هەکاری دناڤ کورداندا بخانەدان وبحورمەتی ناڤێ وان چوبوو ، وەکی پاشا و مەزنێن میران دهاتنە نیاسین ، و گەلەك خەم و خورو شولکەربوون و هەمی ئەو باژێر و گوندێن ل بن دەسهەلاتا خۆ بەرەف ئاڤەدانی برن و هەولێن بلندکرنا ئاستێ ژین و ژیارا خەلکی دا ، وگرنگی برێك وبازرگانیا وەلاتی دا ، هەرووەسا گرنگ ب زانست و زانیاریێ دا رێز ل زانایان دگرت و قوتابخانە و مەلبەندێن فێرکردنێ وئاڤەدانکرنێ .

### ژناڤدارترین میرێن وێ :

١-میر ئەسەدەدین موسا کورێ مەنگەلان کو ل دەمێ هاتنا مەغۆلان بۆ دەڤەرێ، میرێ میرنشینێ بۆ.

٢-عیمادەدین موجلی کو نەڤیێ میرئەسەدەدین بوو ، بوێ چەندێ هاتبوو نیاسین کو گەلەك حەز ژ زانست و زانینێ دکر ، رێز ل زانا دگرت ، وقوتابخانە بۆ ڤەکرن.

میرنشینا هەکاری پشتی وی سەردەمی هەر ب هێز ما و سەردەمێ ئوسمانی ژیدا میرێن وێ خودان دەسهەلات بوون .

### ٣- میرنشینا بەدلیسێ :

ئەڤ میرنشینە ل باژێری بەدلیسێ ل باکورێ کوردستانێ هەر ژ سەردەمێ عەباسیان پەیدا بوو ، مەزنە ماقویلێن کونفدراسیۆنا هۆزا رۆژەکی دامەزراندبوو، دەسهەلاتا وان یا پشتاو و پشتی ب سەدان سالان ڤەکێشا ، وبنەمالا مێژوو نڤیسێ بناڤ و دەنگ ( شەرەفخانێ بەدلیسی ) میرێ ڤێ میرنشینێ بوو ، و ل دویڤ ئاخفتنێن شەرفخانێ بەدلیسی ناڤێ (١٨) میرێن ڤێ میرنشینێ ب دەست کەفتینە .

### ژمیرێن وێ یێن ناڤدار :

میر شەرەفەدین ئەبو بەکر کو ل دەسپێکێن سەردەمێ دەولەتا جەلائیری دەسهەلات کر ، و ناڤێ وی دکتێبا شەرەفنامێدای هاتی یە ، میرنشین ل سەردەمێ وی دا بچووك و سنوردار بوو . ومیر زیائەدین رۆژەکی کو ل نیڤا چەرخێ چاردێ یێ زایینی میرێ میرنشینێ بو ڤێ ، بزیرەکی و ژێهاتێ ب ناڤ ودەنگ بوو سنورێ میرنشینا خوٚ بەرفرەهکر بوو باکورێ دەریا وان .

**چالاكی:**

قوتابییێ خۆشتڤی ناڤێ دوو پرۆژێن خزمەتگوزارییێ كۆ حوكمەتێ ل بازێرێ یان گوندێ تە دروست كرینە.



وێنێ پرۆژەیەكێ خزمەتگوزاری

گرنگترین دەزگەهێت خزمەتگوزاریێ ژ ئەڤێن خوارێ پێک دهێن:

١- پەروەردە و فێرکرن.
٢- چاڤدێریا ساخلەمیێ.
٣- ڤەگوهاستن و گەهاندن.
٤- کارگوزارییا رەوشەنبیری.
٥- کارگوزارییا ئابووری.
٦- کارگوزاریێن دی.



وێنێ فرۆکەخانێ ئێستگێ پاسێ

**١- پەروەردە و فێرکرن:** ئێکە ژ ئەرکێن هەرە گرنگێن دەولەتێ بۆ پێشڤەبرنا کۆمەلگەهێ ب رێکا ڤەکرنا قوتابخانا ل باژێرو گوندا پێخەمەت بەلاڤکرنا خواندەواریێ و هشیاریێ ل ناڤ کۆمەلگەهێ ب گشت رەنگاڤە (باخچێت زارۆکا، بنەرەت، ئامادەیی، ئامادەییێت پیشەیی، پەیمانگەها، زانکۆیا).



**وێنێ پۆلەکا خواندنێ**

**٢- چاڤدێرییا ساخلەمیێ:** دەولەت بزاڤێ دکەت بۆ ئاڤاکرنا هاوولاتییێ خودان شیان و ساخلەم کۆ بشێت خزمەتا مللەتێ خۆ بکەت لەورا حوکمەتا هەرێما کوردستانێ دەزگەهێن خزمەتگوزارییا ساخلەمیێ ل بازێرو بازێرک و گوندا بۆ هاوولاتیا دابین کرینە وەک:

١- دروستکرنا نەخوشخانێت مەزن کو تایبەتن ب نشتەگەری و چارەکرنا نەخۆشییا.

٢- ڤەکرنا بنکێت ساخلەمیا مللی.

٣- ڤەکرنا بنکێت ساخلەمیێ بۆ پشکنین و چارەسەرکرنا قوتابیا.

٤- ڤەکرنا کولیژێت نوژدارییی و پەیمانگە و ئامادەییێت داپیرکییێ و برین پێچییێ.



کولیژا پزیشکێ ـ زانکۆیا سەلاحەددین

**چالاکی:**

قوتابییێ خۆشتڤی: ساخلەمی زۆر گرنگە بۆ پاراستنا شیانێت مرۆڤی (پاکی و پاقژی)شنگەستا سەرەکییا لەش ساخییێنە....
چ بکەین دا پاک و خاوێنیا قوتابخانا خۆ رابگرین؟.

١- | ٢- | ٣-

## ٣- ڤەگوهاستن و گەهاندن.

حوکمەتا هەرێما کوردستانێ گرنگییەکا تەمام یا دایە پێشخستنا کارگوزاریا ڤەگوهاستن و گەهاندن و هاتوو چوێ دا هاوولاتی ب ساناهی پەیوەندیێ ب هەڤدو بکەن ژ ناڤدا و دەرڤەی هەرێمێ، پویتە یێ دایە ڤەکرنا رێکێن نوی وسەردەم دبنە هۆکارێت گەهاندنێ و هاتووچویەکا بلەز و ڤەگوهاستنێ. هەروەها پویتە یا دایە پۆستە و هێلێن تەلەفۆن و ئامیرێن نوی و بلەز دابین کرینە بۆ ڤی بۆاری.

**راهێنان:**

**چەندین هۆکارێن ڤەگوهاستنێ هەنە، تۆ ژی قوتابیێ خۆشتڤی (چوار) هۆکارێن ڤەگوهاستنێ ل ڤێرە بنڤیسە:**

**١- ...........................**

**٢- ..........................**

**٣- ..........................**

**٤- ........................**

**چالاکی:**

**دڤی سەردەمیدا زۆر هۆکارێن گەهاندنێ یێت نوی پەیدا بۆوینە، قوتابیێ خۆشتڤی ل ڤێرە وێنێ دوو هۆکارێن نوی بکێشە.**

## ٤- کارگوزارییا رەوشنبیری:

ئێک ژ ئامانجێت حوکمەتا هەرێما کوردستانێ پێگەهاندنا هاووەلاتییێ رەوشنبیرو خودان باوەر. باوەری بـ خۆ و ئاخ و نەتەوێ خۆ هەبیت

بۆ ڤێ مەبەستێ ژی چەندین گۆڤار و رۆژنامە و کتێبێت جۆراو جۆر ل گشت بوارێت ژیانێ ئامادەکرینە دگەل ڤەکرنا پێشانگەها کتێب و وێرانا گرنگیدانێ ب ڤەکرنا ئێزگەو کەنالێت راگەهاندنێ و مۆزەخانا کلتووری و مێژوویی ژبلی بایەخدان بـ ڤەکرنا گەلەرا (هۆلا) بۆ هونەرێ شێوەکاری و پویتەدان ب شوینوارا.



منارا موزه‌فه‌رییه‌ ژ شینوارین كه‌ڤنێن كوردستانێیه‌

**چالاکی:**

**مامـوستـايێ رێزدار داخوازێ ج قوتابيا بكه ئەگەر ل بيرا وان بێت چيـرۆكـەكێ ژ وان چيـرۆكـێـن د گـۆڤـارەكـا زارۆكـادا خـواندين د پۆليدا ڤەگێرن (بێژن).**

راهێنان:

قوتابيێ خۆشتڤی بـ دەهان گۆڤارو رۆژنامێت زارۆكا هەنە.

ل ڤێرە بۆمە ناڤێ سێ گۆڤار و روژناما بنڤێسە:

١- ....................

٢- ....................

٣- ....................



وێنێ گۆڤارەكا زارۆكا

**چالاكی:**

مـامـوسـتـايێ خۆشـتڤی/ تو دشێی ب هاريكاريا كـارگـێـريا قـوتـابخـانێ سـەرادانا دەزگـايەكی يان چەند دەزگـايێت خزمەتگوزاريێ رێک بێخی.

## ٥- كارگوزارييا ئابووری:

دەولەت خـەباتێ دكـەت پێـخـەمـەت بلندكـرنا ئـاسـتـێ ژيارا هاووەلاتيـا ب پەيداكرنا دەليڤێت كاری بۆ وان ژبلی بايەخدان ب بەرهەمێ نيشتمانی و چاكتركرنا توخم و جۆرين وی و بەرهەڤكرنا گشت پێداويستێت دی يێن هاووەلاتيا. وەک بريكارێ گشتی و كۆمەلێن هەرەوەز (جمعيه تعاونيه) و كەرتێ ئينانێ و هنارتنا كەلوپەلا و يێن دی.



(وێنێ بانقا هەرێمێ)

**پرسیار:**

بەرسڤا راست هەلبژێرە:

بانقا هەرێمێ هاتیە دامەزراندن بۆ:

١- دابینکرنا پێداویستیێت قوتابخانێ.

٢- دابینکرنا پارێ مووچە و پرۆژا.

**چالاکی:**

١- وێنەیەکی ئاڤەدانکرنا کوردستانێ ب دەفتەرا خۆ ڤەکە.

٢- چیرۆکەکا تە بهیستی ژ بەرنامەیەکێ تەلەفزیۆنی د دەفتەرا خودا بنڤێسە.

**پرسیار:** ڤان ڤالاییێت خوارێ بـ پەیڤەکا گونجای پر بکە.

أ- دەولـەت ................ بــ دوژمــنــێ ئـێـکــێ دانـایـە د کۆمەلگەهێدا.

ب- دڤێت پەیرەوا رێنماییێت ساخلەمیێ بکەین و خۆ ژ ........... بپارێزین، د خەستەخانا دا پەیرەوا ............. بکەین.

ج- بۆارێ ڤـەگـوهاستن و گـەهاندنێ روییـەکێ .................... نیشتمانی ددەت.

د- هاووەلاتیێ دلسۆز باوەریا بـ ...............و ............. هەی.

ه- رەوشـەنبـیـری هۆکـارەکێ گـرنگە بۆ ...........................و ........................... هاووەلاتیێ ژێر د کۆمەلگەهێدا.

و- دوولەت بێ هەولدانا پەیداکرنا دەلیـڤـا ..................... بۆ گشت هاووەلاتیا دایە.

# پشکا سیێ:

# جەژنێت نیشتمانی و ئایینی

## ئێکەم: جەژنێت نەتەوایەتی و نیشتمانی.

### ١- جەژنا نەوروزێ- ٢١ ئادارێ

ئێکەم رۆژا سەرێ سالا کوردییە، جەژنەکا کەڤنا کوردە وەک گشت گەل و نەتەوەێن سەر ڤی ئەردی ب خۆشی بیرەوەرییا وێ دکەن.



وێنێ ئاهەنگا نەوروزێ.

## ٢- رێکەفتنا ١١ی ئاداری سالا ١٩٧٠.

بەرهەمێ مەزنترین شۆرەشا هەڤچەرخا کوردییە کو شۆرەشا ئیلولییە ل ١١ی ئیلولێ سالا ١٩٦١ بەرپابوو.

ئەڤ شۆرەشا مەزن رەدکرنا ستەمکاری و زورداری و پێشێلکرنا مافێ مروڤێ کورد بۆو.

**زانیاریا پێویست:** قوتابیێ خۆشتڤی ل وەلاتێ کوردستانێ چەندین کێمە نەتەوەایەتی و ئایینی هەنە. جەژن و بۆونێن خۆ هەنە. ژ وان جەژنێت نەتەوایەتی و ئایینیێت وان:

**١- (١) نیسانێ جەژنا سەرێ سالا بابلی و ئاشووریانە.**

**٢- (١١) نیسانێ جەژنا رابوونا مەسیحییانە.**

**٣- (٧) کانونا دووێ جەژنا (بێلند) یا ئیزدیانە.**

## ٣- راپەرینا گەلێ کوردستانێ (٥)ی ئاداری ١٩٩١

پشتی زولم و زۆرداریێکا بێ‌سنوورو وێرانکرنا ٤٥٠٠ گوندێن کوردستانێ و ئەنفالکرنا ١٨٢ هەزار مرۆڤێن بێ گونەهێت کورد ب پیر و زارۆک و ئافرەتڤە و کیمایا بارانا حەلەبچە و گەلەک جهێن دی یێن کوردستانێ بییێ گوهدان ب بهایەکێ مرۆڤایەتی ژ ئالێ رژێما بەرێ یا عیراقێڤە وەکر خەلکێ کوردستانێ ل بەر سینگێ دام و دەزگەهێت ستەمکارێن رژێمێ ل (٥) ی ئاداری سالا ١٩٩١ ز. سەرانسەرێ کوردستانێ راپەرن. د ماوێ چەند رۆژەکادا ژ سەری هەتا دوماهیا کوردستانێ هاتە رزگارکرن.

## تنێ بۆ زانین

### رۆژێن رزگارکرنا باژێرێن کوردستانی

١- (٥)ی ئاداری سالا ١٩٩١ راپەرینا گەلێ کوردستانێ ژ باژێرێ رانیا دەست پێ کر.

٢- (٧)ی ئاداری سالا١٩٩١ باژێرێ سلێمانییێ هاتە رزگارکرن.

٣- (٩) ی ئاداری سالا ١٩٩١ باژێرێ شەقلاوە و کۆیێ و دەربەندیخان هاتنە رزگار کرن.

٤- (١١) ی ئاداری باژێرێ هەولێرێ پایتەختێ کوردستانێ هاتە رزگار کرن.

٥- (١٤)ی ئاداری باژێرێ دهۆک و ئامێدییێ هاتنە رزگار کرن.

٦- (٢٠)ی ئاداری ١٩٩١ باژێرێ کەرکویکی (دلێ کوردستانێ هاتە رزگار کرن).



دیمەنەکێ راپەرینێ

## ٤- هەلبژارتنا پەرلەمانێ کوردستانێ ل ١٩ ئایارێ سالا ١٩٩٢ ز. بۆو.

پشتی راپەرینا مەزنا گەلێ کوردستانێ ل (٥) ی ئادارێ سالا ١٩٩١ زایینی و شکەستنا رژێما بەعس و ڤەکێشانا دام و دەزگەها ژ کوردستانێ و بۆ پرکرنا وێ ڤالایا کارگێری کۆ پەیدابووی سەرکردایەتییا (بەرەیێ کوردستان) بریاردا بۆ هەلبژارتنا پەرلەمانەکی بۆ کوردستانێ سەرجەم گەلێ کوردستانێ روژا (١٩) ئایار سالا ١٩٩٢ز. قەستا سندۆقێن دەنگدانێ کر. پەرلەمانێ کوردستانێ هاتە هەلبژارتن.

### هەلبژارتن

هەلبژارتن ئێکە ژ دەستکەفتیێن گەلێ کوردستانێ پشتی دەهان سالا ژ شۆرەش و قوربانیدانێ ئێکەم پرۆسێ ئازادیێ و دیموکراسیا کێم وێنەبوو ب شاهدیا چاڤدێرێن بیانی دڤێ دەڤەرێدا. هەلبژارتن دەستپێکا ئەزموونەکا دیموکراسیبوو ل کوردستانێ ئێکەم پەرلەمان هاتە هەلبژاردن بۆ کوردستانێ.



وێنەیەک ژ هەلبژارتنێ

**٥- حوكمەتا هەرێما كوردستانێ ل (٤) تیرمەهێ سالا ١٩٩٢ز. هاتە دامەزراندن.**

پشتی دامەزراندنا پەرلەمانێ كوردستانێ و ئێكەم كۆمبوونا پەرلەمانی ل ١٩٩٢/٦/٤ێ بۆو. ل رۆژا ١٩٩٢/٧/٤ وێ ئێكەم حوكمەت بۆ هەرێما كوردستانێ هاتە دامەزراندن پشتی حوكمەتا بەغدا خۆ ڤەكێشای ژ كوردستانێ.

دامەزراندنا حوكمەتا هەرێما كوردستانێ دەسكەفتەكا مەزنا گەلێ كوردستانێیە. ددیرۆكا بزاڤا رزگاریخوازا نەتەوێ مەدا. ئەڤە ئێكەم دەرفەتە بۆ مللەتێ كورد هەلكەفتی و بسەلمینیت ژ هیچ نەتەوەیەكی كێمتر نینە بۆ رێڤەبرنا كاروبارێن خۆ ل سەر خاكا خۆ. (مللەتا ئەگەر ڤیا دێ ب سەر ئاگرو ئاسنی سەركەڤن ) .

**٦- راگەهاندنا سیستەمێ فیدرالیێ بۆ كوردستانێ ل (٤)ی چریا ئێكێ سالا ١٩٩٢ز.**

مللەتێ كورد وەكو گشت مللەتێن سەر ئەردی مافێ خۆیێ هەی مافێ چارەنووسا خۆ دیاركەت و قەوارێ خۆ ژی هەبت وەك (تورك، عەرەب، فارس).

بەرژەوەندا هێزێن زل ل دنیایێ وەل مەكر ئەم بێبەهربن ژ مافێت خۆیێت رەوا ل سەر خاكا خۆ.

**پرسیار:**

بۆچی دڤێت مە قەوارا خۆ هەبیت؟.

پەرلەمانێ کوردستانێ ل ١٩٩٢/١٠/٤ بریارا فیدرالییێ بۆ هەرێما کوردستانێ راگەهاند ئەڤ سیستەمە(فیدرالیەت) پەیوەندیيا (رامیاری- یاسایی- ئابووری)یا هەرێما کوردستانێ دگەل دەسهەلاتا ناڤەندی ل سەر بناغێ ئێکەتیا فیدرالیا ئارەزوومەندانە ل چارچۆڤێ عیراقێ دیار دکەت ئەڤە بەرهەمێ راپەرینا مەزنە، ئەڤرۆ کورد خودان پەرلەمان و حوکمەتا هەرێمێیە.



ئاڤاهیێ پەرلەمانێ کوردستانێ

**٧- جەژنا كۆمارا عیراقێ (١٤)ی تیرمەهێیە.**

شۆرشا (١٤)ی تیرمەها سالا ١٩٥٨ز. رویدانەكا رامیارییا گرنگ بۆو دڤێ دەڤەرێدا و ددیرۆكا عیراقێدا كۆ دۆماهی ب رژێما پاشایەتییێ ئینا.

ئەڤ شۆرشە ب پشتەڤانیا سەرجەم گەلێ عیراقێ بەرپابوو.

د بەندێ سییێ دەستوورێ كاتیدا بۆ جارا ئێكێ د دیرۆكا عیراقێدا دان ب وێ هاتە دان كۆ كورد و عەرەب هەڤپشكن د نیشتمانێ عیراقێدا) ل دویڤ یاسایێ مافێت نەتەوایەتی بۆ مللەتێ كورد دهێتە دابینكرن.

**دووەم/ جەژنێت ئایینی و بۆونێت بێنقەدانێ:-**

١- جەژنا رەمەزانێ ل (١، ٢، ٣) هەیڤا شەوالی ب هەلكەفتنا تەمامبوونا هەیڤا رەمەزانا پیرۆز ژ ئالێ **بوسلماناڤە.**

٢- جەژنا قوربانی ل (١٠، ١١، ١٢، ١٣)ی هەیڤا (زی الحجە) ب هەلكەفتنا راوەستانا حەجیا لە سەر چیایێ عەرەفات و تەمامبوونا رێورەسمێت حەجكرنێ.

٣- جەژنا بۆونا سەرێ سالا زایینی ل (١)ێ هەیڤا كانوینا دووێ هەلكەفتنا ژ دایكبوونا حەزرەتێ عیسا پێغەمبەری **(س.ل)**

٤- جەژنا سەرێ سالا كۆچی ل (١)ێ هەیڤا موحەرەمێ ب هەلكەفتا مشەختبوونا موحەمەد پێغەمبەری (س.خ) ژ باژێرێ

مەکەهێ بۆ مەدینێ.

٥-بیرهاتنا عاشورا ل (١٠)ی هەیڤا موحەرەمێ ب هەلکەفتا شەهیدکرنا حەزرەتێ حوسێنی.

٦- جەژنا ژدایکبوونا موحەمەد پێغەمبەری (س.خ) ل (١٢)ی رەبیع الاول (ئەول).

# پشکا چوارێ
# نـــەتـــەوە

نەتەوە کۆمولە کەسەکن ژمێژە وەرە د نیشتمانەکیدا دژین و هەست ب ئێکەتییێ و رەگەزو زمـــان و دیرۆک و رەوشت و چارەنووس و بەرژەوەندیا هەڤبشک دکەن. وەک: نەتەوێ کورد، نەتەوێ عەرەب، نەتەوێ تورک.....هتد.

**بناغێن نەتەوەی:**

## ١- نیشتمانێ هەڤپشک:

نیشتمان ب بناغەیەکێ گرنگ یێ دروستبوونا دەولەتێ دهێتە دانان، هیچ نەتەوەک بێ نیشتمان دروست نابیت و نیشتمان ل جەم کوریێت نەتەوەی پیرۆز و خۆشەویستە. هەست و سوز و خوشەویستییا نیشتمانی کوریێت وی نەتەوەی رێک دئێخیت.

خاکێ کوردستانێ کو هزارەها سالە باب و باپیرێن مە تێدا دژین و بەردەوام خەباتا کری و قوربانییێت داین بۆ پاراستنا وێ ژ هێریشێن دوژمن و داگیرکەرا.

## ٢- زمانێ هەڤپشک:

زمان هۆکارەکە بۆ د ئێک گەهشتن و گوهۆرینا بیرو را د ناڤبەرا کورێن ئێک نەتەوەیدا و هەر نەتەوەیەکی زمانێ نەتەوەایەتییێ خۆ هەیە.

زمـانێ شـرینێ کـوردی بنەمـایەکێ دی یێ ئێکبـوونا سـۆزا نەتەوایەتییە، لەورا داگیرکەرێت کوردستانێ هەمیشە بزاڤێن کرین زمانێ کوردی قەدەغە بکەن و ژ ناڤ ببەن و ژبیرا کورێن کورد ببەن، بۆ ڤێ چەندێ ئەو سیاسەتا نارەوایا داگیرکەرانە، سیاسەتا تورک کـرن و عـەرەب کرن و فـارس کـرن ژمـێـژە و هـەتا نـوکـە دژی زمـانێ کـوردی هاتییـە پیادە (جێبەجێ)کرن. بەلێ بەردەوام نەتەوێ مـە خـەبات دژی وان سـیاسـەتا کریە و یێ شـیای زمـانێ نەتەوایەتییا خۆ بپارێزیت و خزمەتا وی بکەت و گەش بکەت.

## ٣- دیرۆکا هەڤپشک:

مـێـژوویا هەڤپـشک بنەمـایەکێ دی یێ گـرنگە بۆ ئێکخـستنا سوزا نەتەوایەتیێ، نەتەوێ کورد مێژوویەکا کەڤنا د کوردستانێدا هەی و خودانێ شاراستانیەکا خۆیە. هەر ژ دەسپێکا مێژوویێ و هـەتـا نـوکـە بـەردەوام بـەرگـری ژ نـیشـتمـانـێ خـۆ کری و درێکا ویدا هزارەها شـەهیـد داینە. ئەڤ دیرۆکە پر سەروەرییە، جهێ شانازی و سەربلندییێ یە بۆ کوریێت وی، لەورا پێویستە ل سەرمە پویتەی ب مێژوو و کەلەپوورێ خۆ بدەین کۆ هەست و سۆزا نەتەوەیی د کـەنە ئێک و پێـویسـتـە ئەم شـانازیێ ب رویێ پرشـەنگدار و گـەشێ وی بکەین و پەندا ژ سـەرهاتیێن وی وەربگرین، چنکۆ نوکە و ئاییندە گرێدایە ب رابوردوویێ مەڤە.

## ٤- خۆرەوشتێن هەڤپشک:

هەر نەتەوەیەکی سیماو جلوبەرگ و رەوشتێن خۆ هەنە، نەتەوێ

کـورد هاتیـه نیـاسین ب ئازایەتی و دلپاکی و راسـتگوییێ و خـۆ قـوربانکرن درێکا سـەربەسـتی و ئازادییێـدا ژبلی پر رەوشـتـێن رەسەنێن دی زێدەباری رەوشەنبیری و هونەرێ هەڤپشک. ئەڤەنە هەست و سـۆزێن نەتەوێ مـە دکـەنە ئێک و ژ نەتەوێن دی جـودا دکەت.



وێنێ جل وبەرگێن کوردی

## چالاکی

بنەمایێن نەتەوەی چوارن




## راهێنان

(مێژوو گرنگە بۆ میللەتا )

ماموستایێ بەرێز/ رێ بدە قوتابیا بلا گفتوگۆیێ ل سەر بکەن.

## پشکا پێنجێ

# ژینگەھ و پیسبوون

**پێناسا ژینگەھێ:**

ژینگەھ ئەو ناڤەندا جوگرافی و کۆمەلایەتییە دورماندۆرێت مرۆڤی و گیانەوەرا ڤەدگریت. واتە ئەو شوین و سەقایە کۆ ژیانێ تێدا دبەینە سەری و کار دکەتە سەر ژیانا مە. مرۆڤ ژی بەشەکە ژ ژینگەھێ و ئەم نەشێین خۆ ژێ جودا بکەین.

**ژینگەھ دوو جورن:**

١- **ژینگەھا سروشتی:** پێک هاتییە ژ وێ ژینگەھێ ئەوا مرۆڤ تێدا دهیتە سەر دنیایێ و ژیانا خۆ دبیتە سەری. واتە وان خولک و روالەتێن سروشتی ڤەدگرت کۆ مرۆڤ و گیانەوەر لێ دژین.

وەک: سەقا و باران و جۆرێت ئاخێ و بلند و نزمییێت ئەردی و گەرمی و سارییێ.



وێنێ دیمەنەکا سروشتی



وێنێ کارخانەیەکا دویکەل ژێ دچیت

## راهێنان:

**قوتابییێ خۆشتڤی:**

ژینەگەها مە یا ئێکێ ناڤ مالا مەیە، یا دوویێ ژینگەها قوتابخانێیە...وچ باشە بۆ پاراستن و پاقژییا ژینگەها قوتابخانێ.

١- ............................

٢- ............................

٣- ............................

**٢- ژینگەها کۆمەلایەتی:** مەبەست ژ ژینگەهێ ژیانا مرۆڤییە دگەل کەسێت دەوروبەر. واتە ژینگەها خێزانێ یان قوتابخانێ و هەر وەسا ژینگەها مرۆڤی ل تاخێ تێدا دژیت یان گوندێ لێ دژیت، هاتن و چوون و نیاسینێ دگەل جیران وکەسێن دەوروبەری خۆ پەیدا دکەت و پێداویستێن خۆ تێدا دابین دکەت.

**راهێنان:**

ژینگەها کۆمەلایەتی پێک هاتییە ژ خێزان و تاخ و.............. و ..............



**وێنەیەکێ قوتابخانێ**

## چالاكی:

مـامـوسـتـايـێ خـۆشـتـڤی، گـورۆپـەكی ل قـوتـابـخـانـێ هەلبـژێرە دا بەحسێ ژینگەها

١- تاخی بكەن، كاریگەرییا ڤێ ژینگەهێ.

أ- لایێن باش.

ب- لایێن خراب.

پرسیار: چ بكەین بۆ پێشڤەبرنا تاخی؟

## پشکا شەشێ

# مافێن مرۆڤی و زارۆکا

### ١- مافێ مرۆڤی:

مرۆڤ هەر ژ دەستپێکا پەیدابوونا وی ل سەر روییێ ئەردی بزاڤێن کرین بۆ ب دەستڤەئینانا مافێن خۆ، بەردەوام خەباتا کری دا ژبرساتییێ و نەخۆشیا و نەخویندەوارییێ و تەپەسەری رزگار بیت، لەورا دەزگاو رێکخراوێت ناڤ دەولەتی گرنگیا مرۆڤی دای و هەتا روژا ١٩٤٨/١٢/١٠ جارناما مافێ مرۆڤی ل باژێری پاریس هاتە بەلاڤکرن کو ژ (٢٧) بەندا پێکهاتییە، بەحسێ ماف و سەربەستییا دکەت.

### گرنگترین سەربەستییێن مرۆڤی:

### ١- سەربەستییا تاکە کەسی:

رامانا وێ ئەوە هەر کەسەک سەربەستە د هاتن و چوون و کارکرن و دەربرینا بیرو بۆچوون و هزرکرنێدا. ئەڤە ب بناغێ گشت سەربەستییێن دی دهێتە دانان.

### ٢- سەربەستیا خودانییێ:

مروڤ سەربەستە کۆ خودانێ هەموی تشتابیت و ب دلێ خۆ ب کاربینیت و نابیت سامان و مالێ وی دەست ب سەردا بهێتە گرتن وژیستاندن ل دویڤ یاسایێ نەبیت، ستاندنا مال و سامانێ خەلکی قەدەغەیە.

### ٣- سەربەستییا کارکرنێ:

هەر کەسەک سەربەستە کارەکی یان پیشەیەکی بۆ خۆ ببینیت، لەورا یاسایێ بێکاری یا قەدەغەکری.

**چالاکی: قوتابییێ خۆشتڤی:**

مافێ تەیە: بخوینی، فێربی..........

بەشداربێ د چالاکیادا بکەی........

هەر د وی دەمیدا چەند ئەرکەکێن هەین دبێت ئەنجام بدەی لستەیەکێ ب هاریکاریا برادەرێت خۆ ژ ئەرکا بەرهەڤ بکە بۆ وانا بهێت.

**چالاکی : قوتابییێ خۆشتڤی:**

ب هاریکاریا برادەرێت خۆ ڤێ راهێنانێ ئەنجام بدە:

١- مافێ قوتابییە بخوینیت ..............

٢- مافێ قوتابییە فێرببیت ..............

٣- هەر زارۆکەک د تەمەنێ شەش سالییێدا مافێ وی یە ......

٤- رەخساندنا مافێ فێربوونێ بۆ زارۆکێت کوردستانێ ئەرکێ سەرملێت حوکمەتا ..........

**راهێنان:**

ماموستایێ بەرێز: دوو گوروپا ژ قوتابییا پێک بینەوداخوازێ ژ هەردووکان بکە بۆ رامان مافی وئەرکا نموونا بینن.

**٤- سەربەستییا بیرو هزرو کۆمبوون و دامەزراندنا رێکخراوا.**

مرۆڤ سەربەستە ل دەربرینا بیرو هزرو بۆچوون، بەلافکرن د رۆژنامادا، خەلکی سەربەستە کۆمبوونێت تایبەت و گشتی بکەن ئەگەر زیانێ نەگەهیننە کەسەکێ دی یان پەرژەوەندیا نەتەوایەتی.

**٥- سەربەستییا خواندنێ:**

هەر مرۆڤەکی مافێ خواندنێ هەیە هەر ژ تەمەنێ زارۆکینییێ و درێژییێ ب فێربوونێ بدەت ل هەمی قوناغێن خواندنێ.

**٦- سەربەستییا ئایینی و باوەرییێ:**

هەر مرۆڤەکی ماف هەیە بیروباوەرەکا ئایینی بۆ خۆ هەلبژێریت.

**٧- یەکسانی و دادوەری:**

رامانا یەکسانییێ ئەوە کۆ گشت ئەندامێن کۆمەلێ وەک ئێکن د ماف و ئەرکاندا بەرامبەر یاسایێ و دادپەروەرییێ و د فەرمانبەریا گشتیدا و هیچ جیاوازییەک نینە د ناڤبەرا واندا ژبەر رەنگی یان رەگەزی یان ئایینی یان سامانی.

**چالاكى:**

**قوتابيێ خوشتڤى:** تو (سەربەستى)، هەر پرسيارەكێ ژ ماموستاى بكەى ل سەر وانێ.

ماموستا (سەربەستە) د بەرسڤدانەكا گونجاى ل سەر پرسيارا دهێتە ئاراستەكرن......

ئەم هەمووى (سەربەستين) ل پاراستنا پەسند كربێت ژيانێ............

بو وانا بهێت چەند رێزەكا ل سەر رامانا (سەربەستى)يێ ب هاريكاريبا برادەرو خێزانا خو بەرهەڤ بكە.

دگەل ماموستايێ خو يى رێزدار دانوستاندنێ ل سەر بكە.

**جورێن وەكهەڤيێ (يەكسانيێ):**

**١- يەكسانى بەرامبەر ياسايێ:** گشت ئەندامێن كومەلێ يەكسانن بەرامبەر ياسايێ بەرامبەر هەر كەسەكى بێى جياوازى دهێتە جێبەجێكرن.

راهێنان: كى ياسايێ پێشێل دكەت؟ (گفتوگو بهێنەكرن)

**٢- يەكسانى بەرامبەر دادپەروەريێ:** دەستهەلاتيبا دادگەهێ ل سەرهەمى ئەندامێن كومەلێ دهێتە جێبەجێكرن بێى جياوازيبا رەگەزى يان ئاينى يان سامانى.

**٣- يەكسانى د كاركرنێدا:** هەر كەسەكى مافێ كاركرنێ هەيە و هيچ جياوازييەك ناهێتە كرن د ناڤبەرا دوو كەسادا تنێ ل دويڤ شيان و ژێهاتن و باوەرناما نەبيت.

## ٤- یەکسانی د ئەرکاندا:

هەمـوی ئەندامـێن کـۆمـەلێ یەکـسـانـن بەرامـبـەر یاسـایێ، د ئەرکاندا یەکسانن. خر یەکسانن و دانا خـویـك وپیشـادا یـەکـسـانە خزمەتکرنا ئالای ل دویف یاسا و رژێما.

**چالاکی: قوتابییێ خۆشتڤی:**

تە مافێ هەی، ئەرک ژی ل سەر ملێت تەنە.

ئەرکێت تە چنە د ناڤ ڤان خانێت ڤالادا بنڤێسە:

|  |  |  |
| --- | --- | --- |
|  |  |  |



وێنا یاریگەکا زارۆکێ

**چالاکی: قوتابییێ خۆشتڤی:**

ئاینێ ئیسلامێ ل سەر بناغا (وەکهەڤ)ییێ هاتییە دامەزراندن، هەمی ئاینێت ئەسمانی گازی دکەن بۆ (وەکهەڤ)ییێ

(ماموستا ب یەکسانی تەماشەی هەمی قوتابیا دکەت)

**ڤان ڤالاهیا پربکە:**

١- هەمی قوتابی د مافێ فێربوونێدا..............

٢- ماموستا ب ............. تەماشەی قوتابیا دکەت.

٣- وەکهەڤیا بنەمایێ راستەقینەییێ .................

٤- ئایینێ پیرۆزێ ئیسلامێ ل سەر بنەمایێ ........... هاتییە دامەزراندن.

٥- بەرامبەر ............. ئەندامێن کۆمەلێ هەموی وەکهەڤن.

**راهێنان**

د کۆمەلگەها فرە رەگەز و شوپدا چ بکەین؟ (X) (✓):

١- دژایەتییا هەڤدوو بکەین.

٢- پێکڤە بژین، رێزێ ل ئێکودوو بگرین.

٢- مافێت زارۆکی:

## زارۆک کی یە؟

زارۆک ئەو کەسە ئەوێ تەمەنێ وی ژ هەژدە سالییێ کێمترە بیت، بەشەکێ گرنگێ کۆمەلێیە، بربرێ پشتا نەتەوەیە، پاشەرۆژا گەل و نیشتمانییە.



وێنێ زارۆکا یێ بەرەف قوتابخانێ دچن

تەمەنێ ئازادی (٦) سالە، بابێ وی ناڤێ وی ل قوتابخانێ نڤیسیە، چنکۆ مافێ هەر زارۆکەکییە دڤی تەمەنیدا فێری خواندنێ ببیت.

ودڤـێت دەولـەت ژیارەکـا خـۆش بۆ دەییـابا دابین بکەت، مـافێ ئابووری و رەوشەنبیری و کۆمەلایەتی بۆ مسۆگەر بکەت. چنکۆ ئەون بەرپرس ژ پەروەردەو گـــەشکرنـا زارۆکی د تـەمـــەنێ بچویکاتییێدا هەتا مەزن دبیت، پێویستە چاڤدێریێ لێ بکەن و پێداویستیێت وی بو دابین بکەن.

ل (٢) ئیلولا ١٩٩٠ رێککەفتناما مـافێت زارۆکی وەک یاسایەکا جیهانی ژ ئالێ کۆمەلا گشتی یا نەتەوێن ئێککگرتیڤە هاتە راگەهاندن و جێبەجێکرن. ئەڤ رێکەفتنە (٥٤) بەندن.

**چالاکی: قوتابیێ خوشتڤی:**

زارۆکێت جیـهـانێ تویشی زۆر گرفتا بۆوینە ژ وان هەژاری، بەدخۆراکی، نەخواندەواری، شەر ..............

ماموستایێ هێژا/ داخواز بکە ژ قوتابییا ل سەر خرابییێت شەری بئاخڤن.

### جەژنا زارۆکێت جیهانی

هەر سال ٦/١ یا کریە جەژنا زارۆکا، زارۆکێت کورد ژی پشکەکن ژ زارۆکێت جیهانێ، هەر سال ئاهەنگا دگێرن، چنکۆ زارۆک زەلامێ پاشەرۆژێیە بۆ پێشکەفتن و گەشکرنا وەلاتـی بزاڤێ کەن،ود پاشەروژێدا دێ بنە سەرکردە و قوماندارو زانایێت ب ناڤودەنگ، ماموستاییێن دلسۆز و دختۆرێن شارەزا و ئەندازیارێت زیرەک و خودان شیان دا باژێرو وەلاتێ مە ئاڤدان بکەن.

مافێت زارۆکی:

## هندەک ژ مافێت زارۆکی:

١- هەر زارۆکەکی مافێ هەی خودان ناسنامەبیت و ناڤێ نیشتمان و نەتەوێ وی تێدابیت.




وێنێ ئاهەنگەکا جەژنا سالانە یا زاروکان

٢- دەبیاب د بەرپرسیارن ژ پەروەردەکرنا زارۆکا، دەولەت ژی دڤێت هان بدەت دا پەروەردەیەکا راستەقینە بۆ مسۆگەر بکەن.

٣- دڤێت دەولەت پویتە ب پەروەردە و خواندن و روونا کبیرییا زارۆکی بکەت. ب کێماسی دڤێت خواندن ب خورتی و هەروەها ل قۆناغا بنەرەت دابین بکەت.



وێنێ دایک و بابەکی زارۆکێت خو کرینە ملێت خۆ.

٤- پێویستە دەولەت خزمەتگوزارییا ساخلەمییێ بۆ زارۆکا دابین بکەت، واتە ژ ئالێ مەژی (**عەقلی**) و **دەروونیڤە**.

**راهێنان :** بۆچی دڤێت دەولەت خزمەتگوزارییا ساخلەمییێ بۆ زارۆکا دابین بکەت؟

٥- پێویستە شوین و دەم بۆ یارییێن زارۆکا و پشکداری د چالاکییێت ردوشەنبیری و هونەری بهێنە تەرخان کرن و گرنگی ب شانوگەرییێ بهێتە دان و ل قوتابخانا ژی پوبتە ب وانا وەرزشی و وێنەی بهێتە کرن.



**وێنێ تیپا زارۆکا یێ سترانەکێ یان شانویەکێ پێشکێشی دکەن.**

٦- پێــویســتــه دەولەت زارۆکـا ژ کــارێن خـراب و زیانبــەخش بپارێزیت.
٧- زارۆکی مـافێ هەی بیـروبۆچوونێت خۆ ب ئازادی دەربـبـریت و دڤێت بیرو بۆچوونێت وی ب گرنگی بهێنه وەرگرتن.
٨- پێوبسته ل سەر دەولەتێ سەرەگوهیا وان زارۆکا بکەت ئەوێن ژ سۆزو ڤیانا دەیبابا دبێ باهرن، شوین و جلوبەرگ و پێداویستێن ژیانێ بۆ دابین بکەت.



وێنێ بنگەهەکێ ساخلەمیێ ل دەمێ چارەسەرکرنا زارۆکان